# چل گوڵزاری ڕەنگین

# لە خزمەت هاوەڵانی زێڕین

١٤٤٥ هـ

ئامادەکردنی

ئەنەس عبدالرحمن

بسم الله الرحمن الرحيم

## ناسنامەی کتێب

**ناوی کتێب**: چل گوڵزاری ڕەنگین لە خزمەت هاوەڵانی زێڕین

**ئامادەکردنی**: ئەنەس عبدالرحمن

**نەخشەسازی کتێب**: ابو عمرو

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی

الحَمْدُ لِلَّهِ الَّذي أَرْسَلَ مُحَمَّدَاً صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْهُدَى وَالدِّينِ القَويم، وَاخْتَارَلَهُ أَصْحَابَهُ فَسَارُوا عَلَى الصِّرَاطِ المُسْتَقِيم، فَرَضِيَ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ، كَمَا قَالَ اللَّهُ عَزَّوَجَلَّ { وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِوَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا } ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلَى النَّبِيِّ الأَمِينْ، وَعَلَى آلِهِ وَ أَصْحَابِهِ وَمَنْ تَبِعَهُمْ بِإِحْسَانٍ إِلَى يَوْمِ الدِّين، أَمَّا بَعْدُ :

بێگومان فەزڵ و گەورەیی هاوەڵان شتێکی ڕوون و ئاشکرایە، پلە و پایەیان زۆر بەرزە، باشترینی خەڵک و سەردەم بوونە هەروەك خۆشەویست صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی { خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ }، دەبێت ڕێز و خۆشەویستی تەواومان بۆیان هەبێت و خۆشەویستیان لە ئیمانەوەیە و ڕق لێبوونەوەیان لە نیفاقەوەیە هەروەک پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی { لَا يُحِبُّهُمْ إِلَّا مُؤْمِنٌ، وَلَا يُبْغِضُهُمْ إِلَّا مُنَافِقٌ، مَنْ أَحَبَّهُمْ أَحَبَّهُ اللَّهُ، وَمَنْ أَبْغَضَهُمْ أَبْغَضَهُ اللَّهُ}، هاوەڵان کەسانێک بوون اللَّه تَعالَى لێیان ڕازی بووە هەروەک اللَّه تَعالَى فەرموویەتی { وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ }، هاوەڵە بەڕێزەکان هەموو هەوڵ و ماندووبوون و ناخۆشییەکیان بینیوە لەسەر ئەم دینە پاکە تا بە دوای خۆیانی بگەیەنن زۆرێکیان ڕووح و گیانی خۆیان فیدای ئیسلام کردووە وەکوو حەمزە و موصعەبی کوڕی عومەیر و

جەعفەری کوڕی ئەبووتالیب و زەیدی کوڕی حاریثە و ئەبو ڕەواحە و زۆر زۆری تریش، باشترین و چاونەترس ترین کەس بوون لەم ئوممەتە، وازیان لە ماڵ و شـار و وڵات و جێگای خۆیان هێنا و کۆچیان کرد و چون بۆ مەدینەی پیرۆز، بۆیە پێویسـتە موسـڵمان زۆر ئاگاداری زمانی خۆی بێت دەربارەیان و هەرگیز قسـەی ناشـیرین نەڵێت دەربارەیان چونکە ئێمە هەرچی بکەین و ببەخشـین ناگەیەین بەوان، هەروەک پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ فەرموویەتی { **لَا تَسُـبُّوا أَصْـحَابِي ؛ فَلَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا، مَا بَلَغَ مُدَّ أَحَدِهِمْ، وَلَا نَصِـيفَهُ** }، وە هەروەها پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ داوای لێخۆشـبوونی بۆ کردوونە هەروەک فەرموویەتی { **اللَّهُمَّ إِنَّ الْخَيْرَ خَيْرُ الْآخِرَهْ فَاغْفِرْ لِلْأَنْصَـارِ وَالْمُهَاجِرَه** } ، وە ئەم پەرتووکەی بەردەسـتتان چل فەرموودەیە دەربارەی چل هاوەڵی بەڕێز و خۆشەویستە لەگەڵ کورتەیەک لە ژیانیان بە پێویسـتم زانی مسـوڵمانەکەی خۆشـمان لایەنی کەم ئەو چەند فەرموودەیە بزانێت و لەبەریان بکات و چاویان لێبکات و بیانکاتە قودوەی خۆیان، هەوڵم داوە خۆم بەدوور بگرم لە فەرموودەی ضـەعیف و لاواز لەم چل فەرموودەیەدا، چونکە فەرموودەی لاواز زۆر هاتووە دەربارەی گەورەیی هاوەڵان بۆ نموونە ئەم چەند فەرموودەیەی خوارەوە

١ـ{ **إِنَّ الْجَنَّةَ لَتَشْتَاقُ إِلَى ثَلَاثَةٍ : عَلِيٍّ، وَعَمَّارٍ، وَسَلْمَانَ** } سنن الترمذي

واتاکەی{ بێگومان بەهەشت تامەزرۆیە بۆ سێ هاوەڵ: عەلی کوڕی ئەبووتالیب و عەمماری کوڕی یاسر و سەلمانی فارسی }

٢ـ{ **مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى شَهِيدٍ يَمْشِي عَلَى وَجْهِ الْأَرْضِ ؛ فَلْيَنْظُرْ إِلَى طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ** } سنن الترمذي

واتاکەی { هەرکەسێک پێی خۆشە سەیری شەهیدێك بكات كە لەسەر ڕووی زەوی دەڕوات، با سەیری طەلحەی کوڕی عُبَيْدُ اللَّه بكات }

٣–{ **طَلْحَةُ، وَالزُّبَيْرُ جَارَايَ فِي الْجَنَّةِ** } سنن الترمذي

واتاکەی{ طەلحە و زوبەیری کوڕی عەوام جیرانی منن لە بەهەشت دا }

٤–{ **سَيِّدُ الشُّهَدَاءِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَمْزَةُ بْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ** } رواهُ الطبراني

واتـاکەی{ گەورەی شـــەهیـدەکانی ڕۆژی قیـامەت حەمزەی کوڕی عەبـدول موطەلیبە }

هەموو هاوەڵان پلەو پایەیان بەرز و بڵندە، بەڵام بێگومان هەندێکیان پلەیان لە هەندێکی تریان بەرزترە، بە کۆدەنگی هەموو زانایان ئەبوو بەکری صـــدیق باشترین هاوەڵە پاشان عومەر پاشان عوثمان پاشان عەلی کوڕی ئەبووتالیب، جـا ئەوەی لەســـەر ئێمەیە دەبێت ڕەحمەتیـان بۆ بنێرین و ڕێزی تەواویان لێ بنێین و خۆشـمان بوێن و شـوێنکەوتەیان بین و چاویان لێ بکەین و خۆمان لە ژیـانیـان شـــارەزا بکەین و دوور کەوینەوە و دەم بگرین لەم نـاکۆکیـانەی لە نێوانیـان دا ڕووی دا و بێ ئەدەبی نەکەین بەرامبەر هیچیـان بەتـایبەت بە خەلیفەی موسڵمانان پێشەوای خۆشەویست موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان

١/ محرم/ ١٤٤٥هـ

١٩/ ٧/ ٢٠٢٣ز

ئەنەس عبدالرحمن

## ۞ پێشەکی با بزانین بە کێ دەوترێت صەحابە

قَالَ الإِمَامُ البُخَارِىُّ رَحِمَهُ اللَّه فى صَحِيحِهِ

{ مَنْ صَحِبَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَوْ رَآهُ مِنَ الْمُسْلِمِينَ فَهُوَ مِنْ أَصْحَابِهِ }

واتاکەی { هەرکەسێک هاوەڵایەتی پێغەمبەری صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کردبێت، یان ئەوەی پێغەمبەری صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بینی بێت لە مسوڵمانان ئەوە لە هاوەڵانی پێغەمبەرە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ }

وَقَالَ ابْنُ حَجَرٍ العَسْقَلاني

{ مَنْ لَقِيَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، مُؤْمِناً بِهِ، وَمَاتَ عَلَى الإِسْلام } (الإصابة )

واتاکەی { هەرکەسێک گەیشتبێتە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، بڕوای پێ هێنابێت، وە لەسەر ئیسلامیش مردبێت }

## ١. پێشەوا ئەبووبەکری صدیق

عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ

{ نَظَرْتُ إِلَى أَقْدَامِ الْمُشْرِكِينَ عَلَى رُءُوسِنَا وَنَحْنُ فِي الْغَارِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَوْ أَنَّ أَحَدَهُمْ نَظَرَ إِلَى قَدَمَيْهِ؛ أَبْصَرَنَا تَحْتَ قَدَمَيْهِ. فَقَالَ: يَا أَبَا بَكْرٍ، مَا ظَنُّكَ بِاثْنَيْنِ اللَّهُ ثَالِثُهُمَا؟ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

**واتای فەرموودەکە:** لە ئەبووبەکری صدیقەوە اللّه تَعالَی لێی ڕازی بێت فەرموویەتی { سەیری پێی هاوبەش دانەرانم کرد لەسەر ئێمە بوون وە ئێمە لەناو ئەشکەوت بووین، جا وتم ئەی نێردراوی اللّه بێگومان ئەگەر یەکێکیان سەیری پێیەکانی بکات ئێمە دەبینێت لەژێر پێیەکانی، جا پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی ( ئەی ئەبووبەکر گومانت چیە بە دووان اللّه تَعالَی سێیەمیان بێت؟ ) }

### واتای وشەکان

**نَظَرْتُ** : سەیرم کرد، تەماشام کرد

**أَقْدَامِ الْمُشْرِكِينَ** : پێی هاوبەش دانەران

**أَقْدَامِ** : پێیەکان، جەمع و کۆی قَدَم ییە

**الْمُشْـرِكِينَ** : هاوبەش دانەران، موشـریکەکان، مُشْـرِكِين جەمع و کۆی مُشْرِك ییە

**عَلَى رُءُوسِـــنَا** : لەســەر ســەری ئێمە، رُءُوس جەمع و کۆی رَأْس ییە، واتا سەر

**وَنَحْنُ** : وە ئێمە ( پێغەمبەر و ئەبووبەکر )

**فِي** : لەناو

**الْغَارِ** : ئەشکەوت، کونێکە لە چیادا، لێرە مەبەستی ئەشکەوتی ثەورە

**أَحَدَهُمْ** : یەکێک لەوان ، یەکێک لە موشـــریکان، هُمْ دەگەڕێتەوە بۆ الْمُشْرِكِينَ

**نَظَرَ إِلَى قَدَمَيْهِ** : سەیری دوو پێیەکانی کرد

**أَبْصَرَنَا** : ئێمەی بینیوە

**تَحْتَ قَدَمَيْهِ** : لەژێر پێیەکانی، لەژێر دوو پێیەکەی

**مَا ظَنُّكَ** : گومانت چیە ( ئەبووبەکر )

**بِاثْنَيْنِ** : بەدووان

**اللَّهُ ثَالِثُهُمَا** : اللَّه تَعالَى ســێیەمیانە، هما دەگەڕێتەوە بۆ اثْنَيْنِ ئەویش پێغەمبەر و ئەبوو بەکرن

## چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١– لەم فەرموودەیەدا گەورەیی تەوەکول و پشــت بەســتانی پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَــلَّمَ مان بۆ دەردەکەوێ، لەو پەڕی ناخۆشــی دا ناترســێت و بێتاقەت نابێ و دەفەرموێت ( **يَا أَبَا بَكْرٍ، مَا ظَنُّكَ بِاثْنَيْنِ اللَّهُ ثَالِثُهُمَا ؟** )

٢– ئەم فەرموودەیە یەکێکە لە گەورەترین فەرموودەکان لەســەر گەورەیی ئەبووبەکری صــدیق، واز لە هەموو شــتێک دەهێنێت و لەمـاڵ و منـاڵی دادەبڕێت لەبەر کۆچ کردن و بەردەوام بوونی لەگەڵ پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

٣– دروستە ڕاکردن بەدینەوە لە ترسی دوژمن و خۆ شاردنەوە لە ئەشکەوت و لەماڵان و شوێنی تر لەبەر کوشتن و گرتن

٤– ترس و غەمی ئەبوو بەکری صــدیق لەبەر خۆی نەبووە بەڵکوو لەبەر ئەوەی بووە دوژمنانی ئیســلام دەســتیان بە پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ بگات و دەعوە پاکەکەی بۆ اللَّه تَعالَى بپچڕێت و نەمێنێت

## کورتەیەک لە ژیانی پێشەوا ئەبووبەکری صدیق

ناوی تەواوی بریتییە لە عبداللَّەی کوڕی عوثمانی کوڕی عامری کوڕی عەمری کوڕی کەعبی کوڕی سەعد، دایکی ئەبووبەکر ناوی ( سەلما)ی کچی صەخری کوڕی مالیکی کوڕی عامری کوڕی عەمرە، کونییەکەی بریتییە لە أُمُّ الخَیْر، یەکێک لەگەورەیی ئەبووبەکری صدیق ئەوەیە دایکی و باوکی و هەموو منداڵەکانی مسوڵمان بوونە.

ئەبووبەکری صدیق بەبێ جیاوازی لەلای سەلەف و خەلەف باشترین کەس بووە لەدوای پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وە زاناترین و تێگەیشتووترین هاوەڵ بووە، بەهۆی ئەبووبەکری صدیقەوە چەندین کەڵە پیاوی گەورە هیدایەتیان وەرگرتووە لەوانە عثمانی کوڕی عەفان و زوبەیری کوڕی عەوام و طەلحە و عبد الرحمن ی کوڕی عەوف و سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص، وەسف کراوە بە صِدِّیق لەبەر ئەوەی یەکەم بەڕاست دانەرو مسوڵمان بووە بەبێ موعجیزە، ئەبووبەکری صدیق دوو ساڵ و سێ مانگێک خەلیفەی مسوڵمانان بووە لەدوای پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، ئەبووبەکری صدیق ١٤٢ فەرموودەی گێڕاوەتەوە لە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، لە تەمەنی ٦٣ ساڵی دا وەفاتی کردووە ، اللَّە تَعالَی لێی ڕازی بێت

## گەورەیی ئەبووبەکری صـــدیق لە چەند فەرموودەیەکی تری صەحیح دا

➢ ئەبووبەکری صدیق خۆشەویسترین پیاو بووە لەلای پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ، قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّه { **أَيُّ النَّاسِ أَحَبُّ إِلَيْكَ ؟ قَالَ : عَائِشَةُ " قُلْتُ : مِنَ الرِّجَالِ ؟ قَالَ : أَبُوهَا** } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واتای فەرموودەکە: لە عەمری کوڕی عاصەوە فەرموویەتی، وتم ئەی نێردراوی اللّە { چ کەسێک خۆشەویسترین کەسە لەلات ؟ فەرمووی عائیشە، وتم لە پیاوان؟ فەرمووی باوکی عائیشە ( ئەبووبەکری صدیق)}

➢ ئەبووبەکری صدیق موژدەیەی بەهەشتی پێدراوە لەلایەن پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ { **مَنْ أَصْبَحَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ صَائِمًا ؟ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا. قَالَ : فَمَنْ تَبِعَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ جَنَازَةً ؟ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا. قَالَ : فَمَنْ أَطْعَمَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ مِسْكِينًا ؟ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا. قَالَ : فَمَنْ عَادَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ مَرِيضًا ؟ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : مَا اجْتَمَعْنَ فِي امْرِئٍ إِلَّا دَخَلَ الْجَنَّةَ** } رواه مسلم

واتای فەرموودەکە: پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی { چ کەسێک لە ئێوە بەیانی کردۆتەوە بەڕۆژووە؟ ئەبوو بەکری صـــدیق فەرمووی من، پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ فەرمووی چ کەسێک لە ئێوە ئەوڕۆ شـوێنی جەنازەیەک کەوتووە؟ ئەبوو بەکری صـدیق فەرمووی من، پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ فەرمووی چ کەسـێک لە ئێوە ئەوڕۆ خواردنی داوە بە هەژارێک؟ ئەبوو بەکری صـدیق فەرمووی من، پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ فەرمووی چ کەسـێک لە ئێوە ئەوڕۆ سـەردانی نەخۆشـێکی کردووە؟ ئەبوو بەکری صـدیق فەرمووی من، جا فەرمووی پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ ئەو ڕەوشـت و خەسـڵەتانە کۆنابنەوە لە مرۆڤێک ئیللا دەچێتە بەهەشتەوە ( بەبێ حیساب ) }

- ئەبووبەکری صدیق باشترین پیاو بووە لەدوای پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەم ئوممەتەدا

عَنْ مُحَمَّدِ ابْنِ الْحَنَفِيَّةِ ، قَالَ : قُلْتُ لِأَبِي : { **أَيُّ النَّاسِ خَيْرٌ بَعْدَ رَسُـولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ؟ قَالَ : أَبُو بَكْرٍ، قُلْتُ : ثُمَّ مَنْ ؟ قَالَ : ثُمَّ عُمَرُ....**} رواه البخاري

واتـای فەرموودەکە: لە موحەممەدی کوڕی حەنەفییەوە فەرموویەتی: بە بـاوکم ( عەلی کوڕی ئەبووتالیب )م وت: چ کەسـێک بـاشـترین کەس بووە لەدوای پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ؟ پێشـەوا عەلی کوڕی ئەبووتالیب فەرمووی ئەبوبەکر، وتم لە پاشان کێ ؟ فەرمووی عومەری کوڕی خەتاب....}

عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ : { **كُنَّا نُخَيِّرُ بَيْنَ النَّاسِ فِي زَمَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَنُخَيِّرُ أَبَا بَكْرٍ، ثُمَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ، ثُمَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ، رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ** } رواه البخاري

واتای فه‌رمووده‌كه: له عبد اللّٰه‌ی كوڕی عومه‌ره‌وه فه‌رموویه‌تی { ئێمه هه‌ڵمان ده‌بژارد له‌نێوان هاوه‌ڵان له‌سه‌رده‌می پێغه‌مبه‌ردا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، جا ئه‌بوو به‌كرمان هه‌ڵده‌بژارد له پاشان عومه‌ر له پاشان عوثمان، اللَّه تَعالَی لێیان ڕازی بێت }

➢ ئه‌بووبه‌كری صدیق یه‌كه‌م پیاوی ئازاد بووه بڕوای به پێغه‌مبه‌ر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هێناوه

عَنْ عَمَّارِ بْنِ ياسِرٍ يَقُولُ { **رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمَا مَعَهُ إِلَّا خَمْسَةُ أَعْبُدٍ، وَامْرَأَتَانِ، وَأَبُو بَكْرٍ** } رواه البخاري

واتای فه‌رمووده‌كه: له عه‌مماری كوڕی یاسره‌وه ده‌فه‌رمووێ { پێغه‌مبه‌ری اللَّه تَعالَی م بینی كه‌سی له‌گه‌ڵ نه‌بوو بێجگه له پێنج كۆیله و دوو ئافره‌ت و ئه‌بووبه‌كری صدیق }

➢ ئەبووبەکری صدیق نازناوی صدیقی لێنراوە لەلایەن پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ( صِدِّيق واتا زۆر ڕاستگۆ )

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ { **صَعِدَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى أُحُدٍ، وَمَعَهُ أَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ، وَعُثْمَانُ، فَرَجَفَ بِهِمْ، فَضَرَبَهُ بِرِجْلِهِ، قَالَ : اثْبُتْ أُحُدُ ؛ فَمَا عَلَيْكَ إِلَّا نَبِيٌّ، أَوْ صِدِّيقٌ، أَوْ شَهِيدَانِ** } رواه البخاري

واتای فەرموودەکە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە فەرموویەتی { پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سەرکەوت بەسەر کێوی ئوحود، ئەبوو بەکری صدیق و عومەر و عوثمانی لەگەڵدا بوو، جا کێوی ئوحود لەرزی و کەوتە جولەوە، جا پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بەپێی لە کێوی ئوحودی دا، فەرمووی: جێگیر و ئارام بە ئەی ئوحود، لەسەر تۆ نیە جگە لە پێغەمبەرێک و ڕاستگۆیێک و دوو شەهید نەبێ }

➢ هەر لە گەورەیی ئەبووبەکری صدیقە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

فەرموویەتی { **لَوْ كُنْتُ مُتَّخِذًا مِنْ أُمَّتِي خَلِيلًا لَاتَّخَذْتُ أَبَا بَكْرٍ، وَلَكِنْ أَخِي وَصَاحِبِي** } مُتَّفَقٌ عَلَيه

واتای فەرموودەکە { ئەگەر هەڵمبژاردبوایە لە ئوممەتەکەم دۆستێکی خۆشەویست ئەوە ئەبوو بەکری صدیقم هەڵدەبژارد، بەڵام ئەبووبەکری صدیق برامە لەدین و دۆست و هاوەڵمە }

➢ ئەبووبەکری صدیق جێنشینی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بووە لە نوێژدا

عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ فِي مَرَضِهِ {**مُرُوا أَبَا بَكْرٍ يُصَلِّي بِالنَّاسِ " قَالَتْ عَائِشَةُ : قُلْتُ : إِنَّ أَبَا بَكْرٍ إِذَا قَامَ فِي مَقَامِكَ لَمْ يُسْمِعِ النَّاسَ مِنَ الْبُكَاءِ، فَمُرْ عُمَرَ فَلْيُصَلِّ. فَقَالَ: مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ**...} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واتای فەرموودەکە: لە دایکی بڕوادارانەوە عائیشە، بێگومان پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی لەنەخۆشییەکەی دا { فەرمان بە ئەبووبەکر بکەن نوێژ بۆ خەڵکی بکات، عائیشە فەرمووی : گوتم: بێگومان ئەبوو بەکر ئەگەر بوەستێ لە شوێن و جێگای تۆ دا ناتوانێ خەڵکی گوێبیست بکات بەهۆی گریانەوە، بۆیە فەرمان بە عومەر بکە با نوێژ بۆ خەڵکی بکات، جا پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی : فەرمان بە ئەبووبەکر بکەن پێشنوێژی بکات بۆ خەڵکی }

## ٢. پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

{ دَخَلْتُ الْجَنَّةَ، فَرَأَيْتُ فِيهَا دَارًا - أَوْ قَصْــرًا - فَقُلْتُ : لِمَنْ هَذَا ؟ فَقَالُوا : لِعُمَرَبْنِ الْخَطَّابِ، فَأَرَدْتُ أَنْ أَدْخُلَ، فَذَكَرْتُ غَيْرَتَكَ " فَبَكَى عُمَرُ، وَقَالَ : أَيْ رَسُولَ اللَّهِ، أَوَعَلَيْكَ يُغَارُ؟ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

**واتای فەرموودەکە:** پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی { چومە ناو بەهەشـــت، جا ماڵێکم بینی تێیدا - لەبەهەشـــت دا - یان قەسرێکم - بینی لەبەهەشت دا -، جا وتم: ئەو ماڵە یان ئەو قەسرە بۆ کێیە ؟ وتیان : بۆ عومەری کوڕی خەتابە، جا ویســـتم بچمە ناویەوە، غیرەت و پیـاوەتی تۆم بەبیر هـاتەوە - بۆیە نەچوومە نـاویەوە - جا پێشـــەوا عومەر گریاو فەرمووی : ئەی نێردراوی اللَّه، ئایا لەســـەر تۆ عومەر غیرەت دەیگرێ؟ ( لە گێڕانەوەیەکی تردا – ئایا لەسەر تۆ غیرەت دەمگرێ ؟ ) }

## واتای وشەکان

دَخَلْتُ الْجَنَّةَ : چوومە ناو بەهەشت

فَرَأَيْتُ : جا دیتم ، بینیم

فِيهَا : لەناو بەهەشت دا، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ الْجَنَّةَ

دَارًا : ماڵێک

أَوْ : یان

قَصْرًا : قەسرێک، کۆشکێک

فَقُلْتُ : جا وتم، پێغەمبەر فەرمووی( بە جبریل یان بە مەلائیکەتێکی تر )

لِمَنْ : بۆ کێیە

هَذَا ؟ : ئەو ماڵە، ئەو کۆشکە ؟

فَقَالُوا : جا فەرموویان، وتیان مەلائیکەتەکان

لِعُمَرَبْنِ الْخَطَّابِ : بۆ عومەری کوڕی خەتابە

أَرَدْتُ : ویستم، ئارەزووم کرد

أَنْ أَدْخُلَ : داخیل بم، بچمە ناوییەوە

ذَكَرْتُ : بیرم کەوتەوە، بیرم هاتەوە

**غَيْرَتَكَ** : غیرەت و شەهامەتی تۆ

**بَكَى عُمَرُ** : گریا عومەر، پێشەوا عومەر گریا

**قَالَ** : وتی، فەرمووی پێشەوا عومەر

**أَيْ رَسُولَ اللَّهِ** : ئەی نێردراوی اللّه

**أَوَعَلَيْكَ يُغَارُ؟** : ئایا غیرەت لەتۆ دەکرێ؟

**أَوَعَلَيْكَ** : ئایا لەسەر تۆ

**يُغَارُ؟** : غیرەت دەیگرێ ؟ غیرەت دەکرێ

## ۞ چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١ – ئەم فەرموودەیە فەزڵێکی ڕوون و ئاشکرایە بۆ پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب، چونکە موژدەی بەهەشتی تێدایە

٢ – ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بەهەشت لە ئێستادا بوونی هەیە و درووست کراوە

٣– جێگیر کردنی موژدە بەخەون بینین، بەتایبەت بە خەونی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی {**لَمْ يَبْقَ مِنَ النُّبُوَّةِ إِلَّا الْمُبَشِّرَاتُ " قَالُوا : وَمَا الْمُبَشِّرَاتُ ؟ قَالَ : الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ** } رواه البخاري

واتاكه‌ی: هیچ شتێک نه‌ماوه‌ته‌وه له پێغه‌مبه‌رایه‌تی جگه له موژده‌كان، وتیان: موژده‌كان چیه ؟ پێغه‌مبه‌ر صَــلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَــلَّمَ فه‌رمووی خه‌ونی چاک و باش

وه‌هه‌روه‌ها پێغه‌مبه‌ر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فه‌رموویه‌تی { رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واتاكه‌ی: خه‌ونی بڕوادار به‌شێكه له چل و شه‌ش به‌شی پێغه‌مبه‌رایه‌تی

٤– له‌م فه‌رمووده‌یه‌دا ئه‌وه‌مان بۆ ده‌رده‌كه‌وێت پێشه‌وا عومه‌ر كه‌سێكی زۆر به‌غیره‌ت و شه‌هامه‌ت و پیاو بووه له‌سه‌ر ماڵ و مناڵ و خێزانی

# باسێکی کورتی عومەری کوڕی خەتاب

ناوی ( عومەری کوڕی خەتابی کوڕی نوفەیل )بووە، لە ساڵی شەشەمی پێغەمبەرایەتی مسوڵمان بووە، دووەم خەلیفەی مسوڵمانان بووە، بۆ ماوەی ١٠ساڵ خەلیفە بووە لە ساڵی ١٣ی کۆچی تا ٢٣ی کۆچی، کونییەکەی بریتییە لە أَبُو حَفْص، لەقەب و نازناوی فاروقە، وتراوە یەکەم کەس پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ پێی وتووە فاروق، وە وتراوە ئەهلی کتاب یەکەم جار پێیان وتووە فاروق، وە وتراوە جبریل یەکەم جار پێی وتووە فاروق، مسوڵمان بوونی عومەری کوڕی خەتاب سەرکەوتن بوو بۆ مسوڵمانان وە شکستێکی گەورەبوو بۆ کافر و موشریکان، لەتەمەنی ٦٣ ساڵی دا شەهید کرا و لە تەنیشت پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و ئەبووبەکری صدیقە وە نێژراوە، پێشەوا عومەر دوو داوای کردبوو لە اللَّه یەکیان شەهیدی بوو ئەوی تریان مردن بوو لە شاری مەدینە، هەردووکیان هاتنەجێ

عَنْ زَيْدِ ابْنِ أَسْلَمَ : أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ كَانَ يَقُولُ { **اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ شَهَادَةً فِي سَبِيلِكَ وَوَفَاةً بِبَلَدِ رَسُولِك صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ~ فَاسْتَجابَ اللَّهُ لَهُ وَرَزَقَهُ الشَّهَادَةَ فِي المَدِينَة** }[1]

واتا // زەیدی کوڕی ئەسلەمە دەفەرموێت عومەری کوڕی خەتاب دەیفەرموو { ئەی اللَّه تَعالَى من داوای شەهیدیت لێ دەکەم لەپێناو تۆ ، وەداوات لێ دەکەم بمرم لەشاری پێغەمبەرەکەت ~ اللَّه تَعالَى داوایەکەی وەرگرت و شەهیدی پێ بەخشی لەشاری مەدینەدا

---

[1] صحيح البخاري

## گەورەیی عومەری کوڕی خەتاب لە چەند فەرموودەیەکی تری صەحیح دا

➢ لەگەورەیی عومەری کوڕی خەتاب ئەوەیە، شەیتان ئەترسا لەو ڕێگایەی پێشەوا عومەری پێدا دەڕۆیشت

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

{ **وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، مَا لَقِيَكَ الشَّيْطَانُ قَطُّ سَالِكًا فَجًّا : إِلَّا سَلَكَ فَجًّا غَيْرَ فَجِّكَ** } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واتای فەرموودەکە { سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، شەیتان پێت ناگات لە ڕێگایەکدا ، ئیللا ڕێگایەکی تر دەگرێتەبەر جگە لەو ڕێگایەی تۆ }

➢ لەدوای ئەبووبەکری صدیق خۆشەویسترین پیاو بووە لەلای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم

عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ، قُلْتُ { **أَيُّ النَّاسِ أَحَبُّ إِلَيْكَ ؟ قَالَ : عَائِشَةُ " فَقُلْتُ : مِنَ الرِّجَالِ، فَقَالَ : أَبُوهَا " قُلْتُ : ثُمَّ مَنْ ؟ قَالَ : ثُمَّ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ** } مُتَّفَقٌ عليه

واتای فەرموودەکە: لە عەمری کوڕی عاصەوە فەرموویەتی، وتم ئەی نێردراوی اللَّه { چ کەسێک خۆشەویسترین کەسە لەلات ؟ فەرمووی عائیشە، وتم لە پیاوان؟ فەرمووی باوکی عائیشە ( ئەبووبەکری صدیق ) وتم ئەی لەپاشان کێ؟ : فەرمووی : عومەری کوڕی خەتاب }

➢ عومەری کوڕی خەتاب باشترین پیاو بووە لەم ئوممەتەدا لەدوای ئەبووبەکری صدیق

عَنْ مُحَمَّدِ ابْنِ الْحَنَفِيَّةِ ، قَالَ : قُلْتُ لِأَبِي : { **أَيُّ النَّاسِ خَيْرٌ بَعْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ؟ قَالَ : أَبُو بَكْرٍ، قُلْتُ : ثُمَّ مَنْ ؟ قَالَ : ثُمَّ عُمَرُ....**} رواه البخاري

واتای فەرموودەکە: لە موحەممەدی کوڕی حەنەفییەوە فەرموویەتی: بە باوکم ( عەلی کوڕی ئەبووتالیب )م وت: چ کەسێک باشترین کەس بووە لەدوای پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ پێشەوا عەلی کوڕی ئەبووتالیب فەرمووی ئەبوبەکر، وتم لە پاشان کێ ؟ فەرمووی عومەری کوڕی خەتاب....}

➢ پێشەوا عومەر موژدەی شەهیدی پێ دراوە لەلایەن پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ { **صَعِدَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى أُحُدٍ، وَمَعَهُ أَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ، وَعُثْمَانُ، فَرَجَفَ بِهِمْ، فَضَرَبَهُ بِرِجْلِهِ، قَالَ : اثْبُتْ أُحُدُ ؛ فَمَا عَلَيْكَ إِلَّا نَبِيٌّ، أَوْ صِدِّيقٌ، أَوْ شَهِيدَانِ** } رواه البخاري

واتای فەرموودەکە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە فەرموویەتی { پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سەرکەوت بەسەر کێوی ئوحود، ئەبوو بەکری صدیق و عومەر و عوثمانی لەگەڵدا بوو، جا کێوی ئوحود لەرزی و کەوتە جولەوە، جا پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بەپێی لە کێوی ئوحودی دا، فەرمووی: جێگیر و هێوربە ئەی ئوحود، لەسەر تۆ نیە جگە لە پێغەمبەرێک و ڕاستگۆیێک و دوو شەهید نەبێ (عومەر و عوثمان) }

➤ مسوڵمان بوونی عومەری کوڕی خەتاب عیززەت بووە بۆ مسوڵمانان

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْـعُودٍ رَضِـيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ{ **مَا زِلْنَا أَعِزَّةً مُنْذُ أَسْـلَمَ عُمَرُ** } رواه البخاري

واتاکەی: عَبْدُ اللَّه کوڕی مەسـعوود فەرموویەتی { بەردەوام ئێمە بەعیززەت بووین لەو کاتەوەی عومەری کوڕی خەتاب مسوڵمان بووە }

➤ پێشـەوا عەمەری کوڕی خەتاب پێغەمبەری صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ لە نەفسی خۆشی خۆشتر ویستووە

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ هِشَامٍ ، قَالَ { كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ آخِذٌ بِيَدِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ : يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَأَنْتَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ إِلَّا مِنْ نَفْسِي. فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : لَا ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْكَ مِنْ نَفْسِـكَ " فَقَالَ لَهُ عُمَرُ : فَإِنَّهُ الْآنَ، وَاللَّهِ لَأَنْتَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ نَفْسِي. فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : الْآنَ يَا عُمَرُ } رواه البخاري

واتـای فەرموودەکە: عَبْدُ اللَّه ی کوڕی هیشـام فەرموویەتی { ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ بووین پێغەمبەر دەسـتی عومەری کوڕی خەتابی گرتبوو، جا عومەری کوڕی خەتاب فەرمووی : ئەی پێغەمبەری اللَّه، بەڕاسـتی تۆ لە هەموو شـتێک خۆشـەویسـتتری لەلای من جگە لە نەفسـی خۆم، جا پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی : نا، سـوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە تا ئەوکاتەی دەبمە خۆشەویستتر لەلات لە نەفسی خۆشت، جا عومەر پێی فەرموو: ئەوە ئێسـتا، سـوێند بە اللَّه تۆ خۆشـەویسـتتری لەلام لە نەفسـی خۆشـم، پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ فەرمووی: ئێسـتا ئەی عومەر( ئێستا ئەوەی پێویست بوو وتت ئەی عومەر )

## ٣. پێشەوا عوثمانی کوڕی عەففان

عَنْ عَائِشَـةَ رَضِـيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ { كَانَ رَسُـولُ اللَّهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ مُضْـطَجِعًا فِي بَيْتِي كَاشِـفًا عَنْ فَخِذَيْهِ - أَوْ سَـاقَيْهِ - فَاسْـتَأْذَنَ أَبُو بَكْرٍ فَأَذِنَ لَهُ وَهُوَ عَلَى تِلْكَ الْحَالِ، فَتَحَدَّثَ، ثُمَّ اسْتَأْذَنَ عُمَرُ فَأَذِنَ لَهُ وَهُوَ كَذَلِكَ، فَتَحَدَّث، ثُمَّ اسْتَأْذَنَ عُثْمَانُ، فَجَلَسَ رَسُـولُ اللَّهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ، وَسَـوَّى ثِيَابَهُ فَدَخَلَ فَتَحَدَّث، فَلَمَّا خَرَجَ قَالَتْ عَائِشَـةُ : دَخَلَ أَبُو بَكْرٍ فَلَمْ تَهْتَشَّ لَهُ، وَلَمْ تُبَالِهِ، ثُمَّ دَخَلَ عُمَرُ فَلَمْ تَهْتَشَّ لَهُ، وَلَمْ تُبَالِهِ، ثُمَّ دَخَلَ عُثْمَانُ فَجَلَسْـتَ، وَسَـوَّيْتَ ثِيَابَكَ ؟ فَقَالَ : أَلَا أَسْـتَحِي مِنْ رَجُلٍ تَسْتَحِي مِنْهُ الْمَلَائِكَةُ } رواه مسلم

**واتـای فەرموودەکە:** لە دایە عـائیشـەوە فەرموویەتی { پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ لە ماڵی مندا پاڵکەوتبوو لەسـەر لا تەنیشـتێك هەردوو ڕانەکەی بەدیارکەوتبوو، یـان دوو قـاچەکەی، جـا ئەبووبەکر داوای مۆڵەتی کرد- بۆ هاتنە ژوورەوە- پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ مۆڵەتی پێدا، وە پێغەمبەر لەسـەر هەمان حاڵ و شـێواز بوو - هەر ڕانەکانی یان قاچەکانی بەدەرەوە بوون - جا ئەبووبەکر دەستی بە قسە

کرد لەگەڵی، لە پاشـــان عومەر داوای مۆڵەتی کرد، مۆڵەتی پێدا و پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـــلَّمَ هەر بەم شـــێوەیە بوو، جا عومەر دەســتی بە قســە کرد لەگەڵی، پاشــان عوثمان داوای مۆڵەتی کرد، جا پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ دانیشـت و جلەکانی خۆی ڕێکخسـت، جا عوثمان چووە ژوورەوە و دەســتی بە قســە کرد، جا کاتێک ڕۆیشــت عــائیشـــە فەرمووی: ئەبوو بەکر هـات ڕووت خۆش نەبوو بۆی وە گرنگیـت پێی نەدا، پـاشـــان عومەر هـات ڕووت خۆش نەبوو بۆی و گرنگیت پێی نەدا، پاشـــان عوثمان هات، جا دانیشـــتی، وە جلەکانت ڕێکخســـت؟ جا پێغەمبەر فەرمووی: ئایا شـــەرم نەکەم لە پیاوێک کە مەلائیکەت شەرمی لێ دەکات }

## ۞ ڕوون کردنەوەیەک

مُحَمَّد یەکێک بووە لە ڕاویەکانی ئەم فەرموودەیە و دەڵێت [ وَلَا أَقُولُ ذَلِكَ فِي يَوْمٍ واحِد ]

واتــاکەی: نــاڵێم ئەو ڕووداوە لە ڕۆژێکـدا بـووە( ڕەنگە لەڕۆژێـک دا هەرسێکیان یەک لەدوای یەک چووبن بۆ لای پێغەمبەر، وە دەشکرێت سەردانی کردنەکەیان لەسێ ڕۆژی جیاواز بووبێت )

## واتای وشەکان

مُضْطَجِعًا : ڕاکشابوو، پاڵکەوتبوو لەسەر لایەک

فِي بَيْتِي : لەماڵی من

كَاشِفًا : بەدیار کەوتبوو

فَخِذَيْهِ : دوو ڕانەکەی، دوو ڕانەکەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، وشەی فَخِذ چەند لوغەیەکی تێدایە، فَخِذ، فَخْذ، فِخِذ

سَاقَيْهِ : دوو قاچەکەی، دوو قاچەکەی پێغەمبەر

فَاسْتَأْذَنَ : جا داوای مۆڵەتی کرد، داوای ئیزنی کرد

أَبُو بَكْرٍ : ئەبووبەکری صدیق

فَأَذِنَ لَهُ : جا پێغەمبەر مۆڵەتی دا بۆی، ئەو هائە بۆ أَبُو بَكْرٍ دەچێتەوە

وَهُوَ : وە ئەو ،وە پێغەمبەر

عَلَى تِلْكَ الْحَالِ : لەسەر ئەو حاڵە بوو

فَتَحَدَّثَ : جا قسەی کرد، ئەبوو بەکر قسەی کرد لەگەڵ پێغەمبەر

ثُمَّ اسْتَأْذَنَ : پاشان داوای مۆڵەتی کرد

عُمَرُ : عومەری کوڕی خەتاب

أَذِنَ لَـهُ : مۆڵەتی پێـدا، پێـغەمبەر ئیزنی دا، ئەو هـائە بـۆ عُـمَـر دەگەڕێتەوە

وَهُوَكَذَلِكَ : وە ئەو هەر ئاوابوو، پێغەمبەر لەسەر هەمان شێواز بوو

فَتَحَدَّثَ : جاقسـەی کرد، پێشـەوا عومەر دەسـتی بەقسـە کرد لەگەڵ پێغەمبەر

ثُمَّ اسْتَأْذَنَ : پاشان داوای مۆڵەتی کرد

عُثْمَانُ : عوثمانی کوڕی عەفان

جَلَسَ : دانیشت

رَسُولُ اللَّهِ : پێغەمبەری اللَّه

وَسَوَّى : ڕێکی کرد، ڕێکی خست- پێغەمبەر -

ثِيَابَهُ : جلەکانی خۆی، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ رَسُولُ اللَّه

فَدَخَلَ : هاتە ناو، هاتە ژوور - عوثمان -

فَتَحَدَّثَ : جا قسەی کرد - لەگەڵ پێغەمبەر

فَلَمَّا خَرَجَ : جا لەو کاتەی دەرچوو و ڕۆیشت -عوثمان-

فَلَمْ تَهْتَشَّ : ڕووت خۆش نەبوو

لَهُ : بۆی،بۆ ئەبوو بەکر، ئەو هائە بۆ ابو بەکر دەگەڕێتەوە

وَلَمْ تُبَالِهِ : وە گرنگیت پێی نەدا، گوێت پێ نەدا، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ ابو بەکر

فَلَمْ تَهْتَشَّ لَـهُ : ڕووت خۆش نەبوو بۆی، ڕووت خۆش نەبوو لەگەڵ پێشەوا عومەر ، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ عُمَر

وَلَمْ تُبَالِهِ : وە گوێت پێی نەدا، گرنگیت پێی نەدا

فَجَلَسْتَ : جا دانیشتی

وَسَوَّيْتَ : وە ڕێکت کرد، ڕێکت خست

ثِيَابَكَ : جلەکانت

فَقَالَ : جا فەرمووی پێغەمبەر

أَلَا أَسْتَحِي : ئایا شەرم نەکەم

مِنْ : لە

رَجُلٍ : پیاوێک

تَسْتَحِي مِنْهُ : شەرم دەکات لێی، شەرمی لێ دەکات، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ رَجُل

الْمَلَائِكَةُ : مەلائیکەت، درووست نیە بوترێت مەلائیکەت مێیینەن بەڵکوو مەلائیکەتەکان نێرن لەسەر وتەی سەلەف

## چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١– ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر گەورەیی پێشەوا عوثمانی کوڕی عەفان بەشێوەیەک باشترین و گەورەترین بەشەر شەرمی لێ دەکات کە پێغەمبەرە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

٢– شەرم و حەیا ڕەوشتێکی جوانە لە ڕەوشتە جوانەکانی مەلائیکەت، بۆیە پێویستە مسوڵمان خۆی برازێنێتەوە بەم ڕەوشتە جوانە، پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی { الحَياءُ كُلُّهُ خَيْرٌ } واتا: شەرم و حەیا هەمووی خێرو چاکەیە

٣– لەم فەرموودەیەدا زیرەکایەتی دایە عائیشە بەدەر دەکەوێت کە پرسیار دەکات بۆ ئەوەی بۆ عوثمانت کرد بۆ باوکم و عومەرت نەکرد هۆکار چی بوو؟

٤– ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ ئەوانەی دەڵێن ڕانەکان عەورەت نینە، چونکە ئەبووبەکر و عومەر هاتن پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ڕانەکانی هەر بەدەرەوە بوون

٥– مەرج نییە بۆ میوان هەڵنەستان نیشانەی ڕێز نەگرتنی بێت، هەروەک لەم فەرموودەیەدا فێری بووین و زانیمان

## باسێکی کورتی عوثمانی کوڕی عەفان

ناوی عوثمان ی کوڕی عەفان ی کوڕی ئەبو العاص ی کوڕی ئومەیە یە، شەش ساڵ دوای ساڵی فیل لە دایک بووە، پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ڕوقەیەی کچی خۆی داوەتێ و کردوویتیە زاوای خۆی لەو کاتەی ڕوقەیە دەمرێت کچەکەی تریشی ئەداتێ بەناوی ئوم کولثوم، هەر بۆیەش لەقەب و نازناوی ذو النُّورَيْن بووە، واتا خاوەن دوو نوورەکە دوای مردنی ئوم کولثوم شەش ئافرەتی تر دەهێنێت ئەمەش ناوەکانیانە، دایکی عەمری کچی جوندوب، فاطیمەی کچی وەلید، فاخیتەی کچی غەزوان، أم البنين کچی عویەینە، ڕەملەی کچی شەیبە، نائیلەی کچی فەرافیصە، کونییەکەی بریتییە لە أبو عَمْرو و أبو عبدالله، وە موژدەی بەهەشت و شەهیدی پێ دراوە لەلایەن پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وە عوثمان ی کوڕی عەفان یەکەم هاوەڵ بووە کۆچی کردووە لەمەککەوە بۆ حەبەشە لەگەڵ ڕوقەیەی خێزانی، زیاد لە ١٠ ساڵ خەلیفەی موسڵمانان بووە و ئیسلام زۆر بڵاوبۆتەوە لەکاتی خەلافەتی پێشەوا عوثمان دا، وەهەروەها کەسێکی خاوەن عیبادەت و نوێژ و ڕۆژووی زۆربوو، لە ساڵی ٣٥ ی کۆچی شەهید کرا بە مەزڵومی لەلایەن خەواریجەکانەوە

## گەورەیی عوثمانی کوڕی عەفان لە چەند فەرموودەیەکی تری صەحیح دا

- پێشـەوا عوثمان موژدەی شـەهیدی پێ دراوە لەلایەن پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ { **صَعِدَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى أُحُدٍ، وَمَعَهُ أَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ، وَعُثْمَانُ، فَرَجَفَ بِهِمْ، فَضَـرَبَهُ بِرِجْلِهِ، قَالَ : اثْبُتْ أُحُدُ : فَمَا عَلَيْكَ إِلَّا نَبِيٌّ، أَوْ صِدِّيقٌ، أَوْ شَهِيدَانِ** } رواه البخاري

واتای فەرموودەکە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە فەرموویەتی { پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ سـەرکەوت بەسـەر کێوی ئوحود، ئەبوو بەکری صـدیق و عومەر و عوثمانی لەگەڵدا بوو، جا کێوی ئوحود لەرزی و کەوتە جولەوە، جا پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بەپێی لە کێوی ئوحودی دا، فەرمووی: جێگیر و هێوربە ئەی ئوحود، لەسـەر تۆ نیە جگە لە پێغەمبەرێک و ڕاسـتگۆیێک و دوو شەهید نەبێ ( مەبەستی عومەر و عوثمان بوو دوو شەهیدەکە ) }

- وَقَالَ النَّبِيُّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ { **مَنْ يَحْفِرْ بِئْرَ رُومَةَ فَلَهُ الْجَنَّةُ " فَحَفَرَهَا عُثْمَانُ** } رواه البخاري و غيره

واتاکەی { هەرکەسێک بیری ڕومە لێ بدات یان بکڕێت ئەوە بەهەشتی بۆ هەیە - ڕومە ناوی بیرێکی گەورەیە لە شـاری مەدینە - جا پێشـەوا عوثمان بیرەکەی لێدا یان کڕی ( واتا پێشـەوا عوثمان بووە هۆکار بۆ ئامادەکردنی ئەو بیرە ئاوە بۆ دەوڵەمەند و فەقیر و ڕێبواران ) }

➢ قَالَ رَسُــولُ اللَّهِ صَــلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَــلَّمَ { **مَنْ جَهَّزَ جَيْشَ الْعُسْــرَةِ فَلَهُ الْجَنَّةُ " فَجَهَّزَهُ عُثْمَانُ** } رواه البخاري و غيره

واتـاکەی { هەرکەسـێک ئـامـادەی کرد جەیشــە زەحمەت و قورســەکە ( مەبەست غەزوەی تەبووک بوو ) ئەوە بەهەشتی بۆ هەیە، جا پێشەوا عوثمان جەیشەکەی ئامادە کرد }

➢ عَنْ أَبِي مُوسَى رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَخَلَ حَائِطًا، وَأَمَرَنِي بِحِفْظِ بَابِ الْحَائِطِ، فَجَاءَ رَجُلٌ يَسْــتَأْذِنُ، فَقَالَ { **ائْذَنْ لَهُ، وَبَشِّــرْهُ بِالْجَنَّةِ " فَإِذَا أَبُو بَكْرٍ، ثُمَّ جَاءَ آخَرُ يَسْتَأْذِنُ، فَقَالَ : ائْذَنْ لَهُ، وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ " فَإِذَا عُمَرُ، ثُمَّ جَاءَ آخَرُ يَسْتَأْذِنُ، فَسَكَتَ هُنَيْهَةً، ثُمَّ قَالَ : ائْذَنْ لَهُ، وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ عَلَى بَلْوَى سَتُصِيبُهُ " فَإِذَا عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ** } مُتَّفَقٌ عليه

واتای فەرموودەکە: لە ئەبو موسـای ئەشـعەرییەوە بێگومان پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ چووە بێسـتانێک، جا فەرمانی پێ کردم بە پاراسـتنی دەرگای ئەو بێستانە، جا پیاوێک هات و داوای مۆڵەتی کرد، پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَــلَّمَ فەرمووی- بە ئەبو موســای ئەشـعەری { مۆڵەتی بدێ و موژدەی بەهەشـتیشـی پێ بدە جا ئەو کەسـە ئەبوبەکر بوو، پاشـان پیاوێکی تر هات داوای ئیزن و مۆڵەتی کرد، پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ فەرمووی ئیزن و مۆڵەتی بدێ و موژدەی بەهەشـتیشـی پێ بدە ، ئەویش پێشــەوا عومەربوو، لەپاشان یەکێکی تر هات داوای مۆڵەتی کرد - بۆ هاتنە ژوورەوە - جا پێغەمبەر

صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ کەمێک وەسـتا لەپاشـان فەرمووی مۆڵەتی بدێ و موژدەی بەهەشتیشی پێ بدە لەسەر ئەو بەڵاو موسیبەتەی لەمەودوا توشی دەبێت جا ئەویش عوثمانی کوڕی عەفان بوو }

## ➢ گەورەیی عوثمان لەلایەن هاوەڵانەوە

عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ { **كُنَّا فِي زَمَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَا نَعْدِلُ بِأَبِي بَكْرٍ أَحَدًا، ثُمَّ عُمَرَ، ثُمَّ عُثْمَانَ، ثُمَّ نَتْرُكُ أَصْحَابَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَا نُفَاضِلُ بَيْنَهُمْ** } رواه البخاري

واتـای فەرموودەکە: لە ئیبن عومەرەوە اللَّه تَعالَى لەهەردووکیان ڕازی بێت فەرموویەتی { ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ کەسمان یەکسان و بەراورد نەدەکرد بە ئەبووبەکر، لەپاشان بە عومەر، لەپاشان بە عوثمان، لەپاشـان وازمان دەهێنا لەهاوەڵەکانی پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەزڵی کەسمان نەئەدا لە نێوانیان دا }

## ٤. پێشەوا عەلی کوڕی ئەبووتالیب

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِعَلِيٍّ

{ أَنْـتَ مِنّـي بِمَنْزِلَـةِ هَـارُونَ مِـنْ مُوسَـى، إِلَّا أَنَّـهُ لَا نَبِـيَّ بَعْـدِي }

مُتَّفَقٌ عَليه

**واتای فەرموودەکە:** پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بە عەلی کوڕی ئەبوتالیبی فەرموو { تۆ بۆ من بە پێگە و جێگای پێغەمبەر هارِوونی بۆ پێغەمبەر موسا، تەنها ئەوەیە هیچ پێغەمبەرێک نییە لە دوای من }

### واتای وشەکان

**أَنْتَ** : تۆ ( ئەی عەلی )

**مِنِّي** : بۆ من

**بِمَنْزِلَةِ** : بە جێگا و شوێنی

**هَارُونَ** : هارِوون ( پێغەمبەر هارِوون )

**مِنْ مُوسَى** : بۆ موسا ( پێغەمبەر مووسا )

**إِلَّا** : تەنها، مەگەر، جگە، بێجگە

**أَنَّهُ** : بێگومان حاڵ و بارودۆخ وایە

**لَا نَبِيَّ** : هیچ پێغەمبەرێک نیە

**بَعْدِي** : لەدوای من، هیچ پێغەمبەرێک نایێت لەدوای من

## چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١– ئەم فەرموودەیە فەزڵێکی گەورەیە بۆ پێشـــەوا عەلی کوڕی ئەبووتـالیـب لەلای اللَّه تَعـالَى و پێغەمبەرەکەیەوە، بە شــێوەیەک پێگەی هـاڕوون علیـه السـلام چۆن بوو بۆ موسـا علیه السـلام پێگەی عەلیش ئاوایە بۆ پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، تەنها ئەوەندەی هەیە پێغەمبەر نەبووە پێشەوا عەلی

٢– زۆرێک لە زانایان ئەو فەرموودەیە دەکەنە دەلیل و بەڵگە کەوا پێغەمبەر عیسـا ئەگەر دابەزێتەوە ســەر دونیا وەکوو پێغەمبەرێک دا نابەزێت بەڵکوو وەکوو حـاکمێـک لە حـاکمە مســوڵمـانەکـانی ئەم ئوممەتە دادەبەزێـت و حوکمیش بە شەریعەتی پێغەمبەری ئێمە دەکات

٣– ڕافیزە کافرەکان ئەم فەرموودەیە دەکەنە بەڵگەو دەڵێن دەبوایە پێشـــەوا عەلی کوڕی ئەبووتالیب لە دوای پێغەمبەر خەلیفەی مســوڵمانان بێت نەک ئەبووبەکری صــدیق و عومەر و عوثمان هەروەکوو چۆن هاروون خەلیفە و جێنشــینی موســابوو ،، بەڵام ئەهلی ســوننەو جەماعە وەڵامیان داونەتەوەو دەفەرموون هاڕوون تەنها لەژیانی دا خەلیفە و جێنشـینی موسـا بووە نەک لە دوای موســـا خەلیفە و جێنشـــین بوو بێـت، چونکە بە کۆدەنگی زانـایـان پێغەمبەر هاڕوون پێش پێغەمبەر موسا وەفاتی کردووە

# کورتەیەک لە ژیانی پێشەوا عەلی کوڕی ئەبووتالیب

ناوی عەلی کوڕی ئەبوتالیبی کوڕی عبد المطلب ی کوڕی هاشمی کوڕی عەبدو منافە، پێشەوا عەلی ئامۆزا و زاوای پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بووە، هەر لە منداڵیەوە لە تەمەنی ١٠ساڵی دا بڕوای بە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هێناوە، وە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بەخێوی کردووەو پەروەردەی کردووە هەر لە منداڵییەوە، دایکی پێشەوا عەلی ناوی فاطیمەی کچی ئەسەدی کوڕی هاشیمە رَضِيَ اللَّهُ عَنْها،وتراوە پێشەوا عەلی رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ نۆ خێزانی هەبووە، ئەمەش ناوی هەندێک لە خێزانەکانییەتی، یەکەم: فاطیمەی کچی رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، دووەم: لەیلای کچی مەسعوود، سێیەم: أسمای کچی عومەیس، چوارەم: ئومامەی کچی عاص، پێنجەم: خەولەی کچی جەعفەر، شەشەم: دایکی سەعیدی کوڕی عوڕوە، خەڵکی دەربارەی پێشەوا عەلی کوڕی ئەبووتالیب بوون بە سێ بەشەوە، بەشێکیان تەکفیریان کرد وەکوو خەواریجەکان، بەشێکی تریان زیادەڕەویان کرد لەگەورەیی پێشەوا عەلی دا، وە لەلای ئەهلی سوننەو جەماعەش پێشەوایەکی خۆشەویست و خاوەن فەزڵ و چاکەیە، وە پێشەوا عەلی کەسێکی تایبەت بووە لە علم و زانست و ئازایەتی و نەرم و نیانی و دونیا نەویستی و ڕەوشتە جوانەکانی تردا، پلەی پێشەوا عەلی لە دوای پلەی پێشەوا عوثمانی کوڕی عەفانەوەیە لەسەر وتەی زۆربەی زانایان، پێشەوا عەلی کەمتر لە ٥ ساڵ خەلیفەی موسڵمانان بووە و لە ساڵی ٤٠ ی کۆچی دا لێی درا و شەهید کرا

## گەورەیی پێشەوا عەلی لە چەند فەرموودەیەکی تری صەحیح دا

➢ پێغەمبەر صَــلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَــلَّمَ شـــایەدی داوە بەوەی عەلی کوڕی ئەبووتالیب اللَّه تَعالَیٰ و پێغەمبەرەکەی خۆش دەوێت

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ، أَنّ رَسُــولَ اللَّهِ صَــلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَــلَّمَ قَالَ يَوْمَ خَيْبَرَ { **لَأُعطِيَنَّ هَذِهِ الرَّايَةَ رَجُلًا يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُــولَهُ، يَفْتَحُ اللَّهُ عَلَى يَدَيهِ " قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطّابِ : مَا أَحْبَبْتُ الْإِمَارَةَ إِلَّا يَوْمَئِذٍ، قَالَ : فَتَسَــاوَرْتُ لَهَا ؛ رَجَاءَ أَنْ أُدْعَى لَهَا. قَالَ : فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ، فَأَعْطَاهُ إِيَّاهَا، وَقَالَ : امْشِ وَلَا تَلْتَفِتْ، حَتَّى يَفْتَحَ اللَّهُ عَلَيْكَ " قَالَ : فَسارَعَلِيٌّ شَيْئًا، ثُمَّ وَقَفَ وَلَمْ يَلْتَفِتْ، فَصَرَخَ : يَا رَسُــولَ اللَّهِ، عَلَى مَاذَا أُقَاتِلُ النَّاسَ ؟ قَالَ : قَاتِلْهِمْ حَتَّى يَشْــهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُــولُ اللَّهِ، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ ؛ فَقَدْ مَنَعُوا مِنْكَ دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إِلَّا بِحَقِّهَا، وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللَّهِ** }

واتـای فەرموودەکە: لە ئەبو هورەیرەوە بێگومـان پێغەمبەر صَــلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَــلَّمَ لەڕۆژی خەیبەر فەرمووی { بێگومان بەیانی ئەو ئاڵایە ئەدەمە پیاوێک اللَّه تَعالَیٰ و پێغەمبەرەکەی خۆش دەوێت ئەو پیاوە، وە اللَّه تَعالَیٰ ســـەرکەوتن تۆمار دەکات لەســەر دەســتەکانی ئەو پیاوە، پێشــەوا عومەری کوڕی خەتاب فەرمـووی: هەرگـیز حەزم بە فەرمـان ڕەوایی نەبـووە جگە لەم ڕۆژەدا، وە پێداگربووم لەســـەری، وە بە ئومێدی ئەوەی بانگ بکرێم بۆ وەرگرتنی ئاڵاکە، ئەبو هورەیرە فەرمووی: پێغەمبەر صَــلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَــلَّمَ بانگی عەلی کوڕی ئەبوتالیبی کرد و ئاڵایەکەی پێبەخشــی و فەرمووی بڕۆ بۆ ئەهلی خەیبەر و

ئاوڕ مەدەوە تا ئەوکاتەی اللَّە تَعالَی ســەرکەوتن تۆمار دەکات بە هۆکاری تۆ، ئەبو هورەیرە فەرمووی: پێشەوا عەلی کەمێک ڕۆیشت پاشان وەستا و ئاوڕی نەدایەوە، جا هاواری کرد ئەی پێغەمبەری اللَّە لەسەر چ شتێک شەڕ لەگەڵ خەڵکی بکەم ؟! پێغەمبەر صَلَّی اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: شەڕیکە لەگەڵیان تا ئەوکاتەی شەهادە دەهێنن کە هیچ پەرستراوێک نیە بە حەق و ڕاستی جگە لە اللَّە ، وە بێگومان موحەممەدیش نێردراوی اللَّە تَعالَی یە، جا ئەگەر وایان کرد، ئەوە لە تۆ ڕێگری کراوە خوێنەکانیان و پارەو پوولەکانیان، مەگەر بە حەق و مافی خوێنەکان و ماڵەکان، وە حیساب و لێپرسینەوەشیان لەسەر اللَّە تَعالَی یە }

➢ پێغەمبەر صَلَّی اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کونیە دادەنێت بۆ پێشەوا عەلی بە أَبُو تُراب

عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ، قَالَ { **جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْتَ فَاطِمَةَ، فَلَمْ يَجِدْ عَلِيًّا فِي الْبَيْت، فَقَالَ : أَينَ ابْنُ عَمِّكِ ؟ فَقَالَتْ : كَانَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ شَيْءٌ، فَغَاضَبَنِي، فَخَرَجَ، فَلَمْ يَقِلْ عِنْدِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِإِنْسَانٍ : انْظُرْ أَيْنَ هُوَ ؟ فَجَاءَ، فَقَالَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ، هُوَ فِي الْمَسْجِدِ رَاقِدٌ. فَجَاءَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَهُوَ مُضْطَجِعٌ قَدْ سَقَطَ رِدَاؤُهُ عَنْ شِقِّهِ، فَأَصَابَهُ تُرَابٌ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَمْسَحُهُ عَنْهُ، وَيَقُولُ : قُمْ أَبَا التُّرَابِ، قُمْ أَبَا التُّرَابِ}** مُتَّفَقٌ عليه

واتای فەرموودەکە: لە سەهلی کوڕی سەعدەوە فەرموویەتی { پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هاتە ماڵی فاتیمە، عەلی دەست نەکەوت لەماڵ، جا پێغەمبەر فەرمووی لەکوێیە کوڕە مامت؟! جا فاتیمە فەرمووی لەنێوان من و عەلی دا کێشـەیەک هەیە و توورەبوو لێم و دەرچوو لە ماڵ، جا قەیلوولەی لەلای من نەکرد، پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی بە پیاوێک سـەیرکە بزانە لەکوێیە عەلی ؟ جا پیاوەکە هات و فەرمووی ئەی پێغەمبەری اللَّه عەلی لەناو مزگەوت نوستووە، جا هاتە لای پێشـەوا عەلی، وە عەلیش پاڵکەوتبوو و عەباکەیەی لەلا تەنیشـیتی کەوتبووە خوارەوە و پشـتی خۆڵاوی ببوو، جا پێغەمبەر هەڵی گرت و خۆڵەکەی دەسـڕی لە تەنیشـتی عەلی و دەیفەرموو هەستە ئەبو توڕاب هەستە باوکی خۆڵ }

لەو کاتییەوە أَبُو تُراب خۆشـترین ناوبووە لەلای پێشـەوا عەلی کوڕی ئەبووتالیب

- لە گەورەیی عەلی کوڕی ئەبووتالیبیە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ پێی فەرمووە { **أَنْتَ مِنِّي، وَ أَنَا مِنْكَ** } رواه البخاري

واتاکەی: پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بە پێشـەوا عەلی فەرموو { ئەتۆ لەمنی و منیش لەتۆم } لە خزمایەتی و خۆشەویستی و کارە چاکەکانی تردا

## ٥. گەورەیی دایکمان خەدیجە

قَالَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

{ خَيْرُ نِسَـــائِهَا مَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ، وَخَيْرُ نِسَـــائِهَا خَدِيجَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ} مُتَّفَقٌ عَليه

**واتای فەرموودەكە** { باشـــترینی ئافرەتی دونیا لەســـەردەمی خۆیدا مەریەمی كچی عیمران ە، وە باشترینی ئافرەتی دونیا لەسەردەمی خۆیدا خەدیجەی كچی خوەیلدە }

## واتای وشەكان

**خَيْرُ** : باشترینی

**نِسَـــائِهَا** : ئافرەتانی دونیا، هەندێک لە زانایان دەفەرموون ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ دُنْیـا، هەنـدێـک دەفەرموون دەگەڕێتەوە بۆ الأُمَّـة، هەندێک دەفەرموون دەگەڕێتەوە بۆ السَّماء و الأَرْض، ئەو جیاوازیەش بۆیە درووســـت بووە چونكە لە فەرموودەكە دا هیچ شـــتێكی وا باس نەكراوە تا بڵێین بۆ ئەو شتە دەگەڕێتەوە

مَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ : مەریەمی کچی عیمرانە ( دایکی پێغەمبەر عیسا علیه السلام )

وَخَيْرُنِسَائِهَا : وە باشترینی ئافرەتانی دونیا لەسەردەمی خۆیدا

خَدِيجَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ : خەدیجەی کچی خوەیلدە ( خێزانی پێغەمبەرمان صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ )

## ۞ چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١– ئەو فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر پلە و پایەو گەورەیی دایکمان خەدیجە

٢– ئەم فەرموودەیە گەورەیی مەریەممان بۆ دەردەخات

٣– ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مەریەم فەزڵی زیاترە لە ئاسیای خێزانی فیرعەون پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی {**كَمَلَ مِنَ الرِّجَالِ كَثِيرٌ، وَلَمْ يَكْمُلْ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا آسِيَةُ امْرَأَةُ فِرْعَوْنَ وَمَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ**} مُتَّفَقٌ عَليه واتا: زۆرێک لەپیاوان کامل و تەواون، وە کامل نیە لە ناو ئافرەتان دا جگە لە ئاسیای خێزانی فیرعەون و مەریەمی کچی عیمران،، بەڵکوو مەریەم باشترین ئافرەتی دونیایە لە دایکمان حەواوە تا کۆتا ئافرەتی دونیا ئەمەش بەدیار دەکەوێت لە زاهیری قورئان و فەرموودەکان دا،، هەروەک اللَّه تعالَى ئاماژەی پێ کردووە { وَإِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰكِ وَطَهَّرَكِ وَٱصْطَفَىٰكِ عَلَىٰ نِسَآءِ ٱلْعَٰلَمِينَ } ال عمران:٤٢

واتای ئایەتەکە { لەو کاتەی مەلائیکەتەکان فەرموویان ئەی مەریەم بێگومان اللَّه تَعالَی تۆی هەلبژاردووە و تۆی پاککردۆتەوە، وە تۆی هەڵبژاردووە بەسەر هەموو ئافرەتانی دونیادا }

٤– هەندێک لە زانایان دەفەرموون ئەو فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ ئەوەی بڵێین مەریەم پێغەمبەر نەبووە چونکە یەکسان کراوە لەم فەرموودەیەدا بە دایە خەدیجەی وە خەدیجەش بە کۆدەنگی زانایان پێغەمبەر نەبووە

## کورتەیەکـــ لە ژیانـــی دایکـــ ئازیزمانـــ دایکە خەدیجە

نـاوی خـەدیجەی کچی خوەیلـدی کچی ئەسـەدە، خێزانی گەورەی پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ بووە، یەکەم کەس بووە بڕوای بە پێغەمبەر هێناوە، لەپێش هاتنی پێغەمبەریش هەر ئافرەتێکی پاک بووە و بە طاهیرە بانگ کراوە، دایکی خەدیجە ناوی فاطیمەی کچی زائیدەیە، نزیک پازدە سـاڵ پێش بوونی بە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مێردی بە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کردووە، وە هەموو منـاڵەکانی پێغەمبەر لە دایە خەدیجە بوونە جگە لە ئیبراهیم نەبێـت لە ماریەی بووە، دایە خەدیجە ئـافرەتێکی جوان و خـاوەن شـەرەف و موڵک و ماڵ بوو، دایکمان خەدیجە بێوەژن بووە لەو کاتەی دەبێتە خێزانی پێغەمبەرمان صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ، ناوی مناڵەکانی دایە خەدیجە بریتی بوون لەمانە ١- القاسـم، بۆیەش بە پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ ئەوترا أبو القاسـم ٢– عبداللَّه، هەردوو کوڕەکەی بە مناڵی وەفاتیان کردووە، ٣– زەینەب ٤– ڕوقەییە، ٥– فاتیمە ، ٦– ئوم کولثوم، هەر چوار کچەکەی مسـوڵمان بوونە و کۆچیان کردووە بۆ مەدینە ، دایکمان خەدیجە بە ٣ ساڵ پێش هیجرەت و کۆچکردنی مسـوڵمـانـان لە مەککەوە بۆ مەدینە وەفـاتی کردووە و ٢٠ سـاڵ زیاتر خێزانی پێغەمبەرمان بووە و تا لە ژیان مابوو هیچ ئافرەتێکی تری نەهێنا پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

## گەورەیی دایکمان خەدیجە لە چەند فەرموودەیەکی تری صەحیح دا

- لە گەورەیی دایکمان خەدیجە ئەوەیە هەر لە دونیادا موژدەی بەهەشتی پێدراوە

عَنْ إِسْـمَاعِيلَ ابْنِ أَبي خالِدٍ قَالَ : قُلْتُ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى رَضِـيَ اللَّهُ عَنْهُمَا {**بَشَّـرَ النَّبِيُّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ خَدِيجَةَ ؟ قَالَ : نَعَمْ، بِبَيْتٍ مِنْ قَصَـبٍ لَا صَخَبَ فِيهِ، وَلَا نَصَبَ** } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واتای فەرموودەکە: لە ئیســماعیلی کوڕی ئەبو خالیدەوە فەرمووی : وتم بە عبداللَّه ی کوڕی ئیبن ئەوفای اللَّه تَعالَی لەهەردووکیان ڕازی بێت : پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ موژدەی داوەتە خەدیجە ؟! عبداللَّه فەرمووی بەڵێ ، بە مـاڵێـک لە جەوهەر و مرواری ئەو مـاڵە نە هـات و هـاواری تێـدایە وە نە ماندووبوونی تێدایە

- عَنْ عَائِشَـةَ قَالَتْ { **بَشَّـرَ رَسُـولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ خَدِيجَةَ بِنْتَ خُوَيْلِدٍ بِبَيْتٍ فِي الْجَنَّةِ** } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واتای فەرموودەکە: لە دایکمان عائیشـەوە فەرموویەتی { پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ موژدەی ماڵێکی بە خەدیجەی کچی خوەیلد دا لەناو بەهەشت }

➢ دایکمان خەدیجە یەکەم ئافرەت و یەکەم کەسیش بووە ئیمانی بە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هێناوە

عَنْ عَمَّارِ بْنِ ياسِرٍ يَقُولُ { **رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمَا مَعَهُ إِلَّا خَمْسَةُ أَعْبُدٍ، وَامْرَأَتَانِ، وَ أَبُو بَكْرٍ** } رواه البخاري

واتای فەرموودەکە: لە عەممارى کوڕى یاسرەوە دەفەرمووێ { پێغەمبەرى اللَّه تَعالَى م دیت کەسی لەگەڵ نەبوو جگە لە پێنج کۆیلە و دوو ئافرەت و ئەبووبەکرى صدیق }( لەسەرەتادا تەنها ئەو چەند کەسە بروایان بە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هێناوە، یەک لەو دوو ئافرەتەش خەدیجەبوو)

➢ لە خۆشەویستی و وەفای پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بۆ دایکمان خەدیجە ئەوەیە دڵی بە خوشکی خەدیجەش خۆش بووە

عَنْ عَائِشَةَ قَالَتِ { **اسْتَأْذَنَتْ هَالَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ أُخْتُ خَدِيجَةَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَعَرَفَ اسْتِئْذَانَ خَدِيجَةَ، فَارْتَاحَ لِذَلِكَ، فَقَالَ : اللَّهُمَّ هَالَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ " فَغِرْتُ، فَقُلْتُ : وَمَا تَذْكُرُ مِنْ عَجُوزٍ مِنْ عَجَائِزِ قُرَيْشٍ، حَمْرَاءِ الشِّدْقَيْنِ ، هَلَكَتْ فِي الدَّهْرِ، فَأَبْدَلَكَ اللَّهُ خَيْرًا مِنْهَا** } رواه مسلم و غيره

واتای فەرموودەکە: لە دایە عائیشەوە فەرموویەتی { خوشکی خەدیجە هالەی کچی خوەیلد داوای ئیزن و مۆڵەتی کرد لە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، پێغەمبەر بیری کەوتەوە شێوازی مۆڵەت و ئیزن خواستنەکەی خەدیجەی - چونکە دەنگیان بەیەک دەچوو - جا پێغەمبەر دڵخۆش بوو بەوە - چونکە

خەدیجەی بیر هـاتەوە - جـا پێغەمبەر فەرمووی ئەی اللّٰە ئەوە هـالەی کچی خوەیلد بێت، منیش- دایە عـائیشـــە - غیرەم کرد و وتم : یـادی پیرێژنێک لە پیرێژنەکانی قورەیش دەکەیتەوە ، شـــەویلاک ســـووری ددان لەدەم نەماوی پووک بەدەرەوە چەندین ســاڵە نەماوە و وەفاتی کردووە، اللّٰە تَعالَی بۆی گۆڕی ویت بە باشتر و جوانتر لەو ( واتا خەدیجەی بۆ گۆڕیوی بەمن ) }

## ٦. گەورەیی دایکمان عائیشە

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

{كَمَلَ مِنَ الرِّجَالِ كَثِيرٌ، وَلَمْ يَكْمُلْ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا آسِيَةُ امْرَأَةُ فِرْعَوْنَ وَمَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ، وَإِنَّ فَضْلَ عَائِشَةَ عَلَى النِّسَاءِ كَفَضْلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَائِرِ الطَّعَامِ} مُتَّفَقٌ عَليه

**واتای فەرموودەکە** { زۆرێک لە پیاوان تەواو و کامل بوونە، لە ناو ئافرەتان دا کامل و تەواویان نییە جگە لە مەریەمی کچی عیمران و ئاسیەی خێزانی فیرعەون، وە بێگومان فەزڵ و گەورەیی عائیشە بەسەر ئافرەتان دا وەکوو فەزڵی شلەی بەگۆشت و نان وایە بەسەر باقی خواردنەکان دا }

### واتای وشەکان

**كَمَلَ** : کامل بووە، تەواوبووە، کَمَلَ چەند لوغەیەکی تێدایە کَمَلَ کَمُلَ کَمِلَ، بەڵام کَمِلَ زۆر کەم بەکاردێت

**مِنَ الرِّجَالِ** : لە پیاوان دا

**كَثِيرٌ** : زۆرێک

**وَلَمْ يَكْمُلْ** : كامل نەبووە، تەواو نەبووە

**مِنَ النِّسَاءِ** : لە ئافرەتان

**إِلَّا** : جگە، بێجگە

**آسِيَةُ امْرَأَةُ فِرْعَوْنَ** : ئاسیەی خێزانی فیرعەون

**مَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ** : مەریەمی کچی عیمران ( دایکی عیسا علیه السلام )

**وَإِنَّ فَضْلَ** : وە بێگومان فەزڵ و گەورەیی و ڕێزی

**عَائِشَةَ** : عائیشە

**عَلَى النِّسَاءِ** : بەسەر ئافرەتان

**كَفَضْلِ** : وەک فەزڵ و گەورەیی

**الثَّرِيدِ** : ثەریدە ، لە نان وگۆشت وشلە پێکهاتووە، وەک تەشریبە گەر نانی تێبکوشی لەگەڵی

**عَلَى** : لەسەر

**سَائِرِ الطَّعَامِ** : باقی و ماوەی خواردنەکان

**سَائِرِ** : باقی ، ماوە

## ۞ چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١– لەم فەرموودەیەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت جۆری نێرینە گەورەتر و بەڕێزترە لە نەوع و جۆری مێیینە، چونکە زۆرێک لە پیاوان کامل و تەواوبوونە لە عەقڵ و هەموو کردەوە چاکەکان دا بۆ نموونە پێغەمبەران بەڵام لە ئافرەتان دا زۆر کەم هەنە کامل و تەواوبن لە عەقڵ و لە هەموو کردەوە چاکەکان دا

٢– لەم فەرموودەیەدا گەورەیی ئاسیەی خێزانی فیرعەون بەدیار دەکەوێت( لە گەورەیی ئاسیەی ئەوەبوو کوشتنی هەڵبژارد بەسەر موڵک و خۆشی دونیادا، وە سزای دونیای هەڵبژارد بۆ چوونە بەهەشتێکی پر خۆشی و نیعمەت دا )

٣– ئەم فەرموودەیە گەورەیی مەریەمەی دایکی عیسای تێدایە، مەریەم باشترین ئافرەتی دونیایە، زانایان جیاوازن لەسەر ئەوەی ئایا مەریەم پێغەمبەر بووە یان نا

٤– وە لەم فەرموودەیەدا گەورەیی دایە عائیشەی تێدایە بەسەر ئافرەتان دا وەک چۆن تەشریب فەزڵی هەیە بەسەر خواردنەکان دا ، ئەو جۆرە خواردنە باشترین خواردن بوو لەو کات دا

## کورتەیەک لە ژیانی دایکی خۆشەویستمان دایکە عائیشە

ناوی عائیشەی کچی عبداللَّه ی کوڕی عوثمانە واتا کچی ئەبووبەکری صدیقە، کونییەکەی بریتییە لە أُمُّ عَبْدِ اللَّه ئەگەرچی هیچ منداڵێکیشی نەبوو، دایکی ناوی أُم رومان ی کچی عامری کچی عومەیرە، چوار ساڵ یان پێنج ساڵ دوای هاتنی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە دایک بووە، لە تەمەنی شەش ساڵی مارەکراوە لە پێغەمبەر، لە نۆ ساڵیدا گواستراوەتەوە و چویتەلای پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، تەمەنی ١٨ ساڵ بوو لەو کاتەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وەفاتی کرد، خۆشەویسترین کەس بووە لەلای پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، ئافرەتێکی ساڵیحەی لە اللَّه ترسی پاک بووە، دووڕووەکان بوختانیان پێکرد پاشان اللَّه تَعالَى لەسەرووی حەوتەم تەبەقەی ئاسمانەوە پاکییەتی عائیشەی ڕاگەیاند، بۆیە هەرکەسێک بڵێت عائیشە کاری خراپی کردووە ئەوە بە کۆدەنگی زانایان کافر دەبێت چونکە قورئانی بەدرۆ خستۆتەوە،، دایە عائیشە زیرەکترین ئافرەت بووە، علم و زانستی دایە عائیشە لە علم و زانستی هەموو خێزانەکانی تری پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زیاتر و چاکتربووە.

پێشەوا عطاء فەرموویەتی: { كانَتْ عائِشَةُ أَفْقَهُ النَّاسِ } واتاکەی: عائیشە شەرعزانترین و فەقیهترینی خەڵکی بووە

عورِوەی کورِی زوبەیر فەرموویەتی { ما رَأَيْتُ أَحَداً مِنَ النَّاسِ أَعْلَم بِالْقُرْآنِ وَلا بِفَرِيضَةٍ وَلا بِحَلالٍ وَحَرامٍ ولا بِشِعْرٍ وَلا بِحَديثِ العَرَبِ وَلا النَّسَبِ مِنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا }

واتاکەی // عورِوەی کورِی زوبەیر فەرموویەتی{ هیچ کەسێکم نەبینیوە زاناتر بێت لە دایە عائیشە بە قورئان و بە فەرزەکان و بەحەلال و حەرام و بە شیعر و بەوتەی عەرەب و بە نەسەب }، دایکمان عائیشە ٢٢١٠ فەرموودەی گێراوەتەوە، لە ساڵی ٥٨ ی کۆچی وەفاتی کردووە و ئەبوو هورەیرە نوێژی لەسەر کردووە و لە گۆرِستانی بەقیع نێژراوە

## گەورەیی دایکمان عائیشە لە چەند فەرموودەیەکی تری صەحیح دا

➢ دایە عائیشە خۆشەویسترین کەس بووە لەلای پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ، قُلْتُ { **أَيُّ النَّاسِ أَحَبُّ إِلَيْكَ ؟ قَالَ : عَائِشَةُ " فَقُلْتُ : مِنَ الرِّجَالِ، فَقَالَ : أَبُوهَا " قُلْتُ : ثُمَّ مَنْ ؟ قَالَ : ثُمَّ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ** } مُتَّفَقٌ عَليه

واتای فەرموودەکە: لە عەمری کورِی عاصەوە فەرموویەتی، وتم ئەی نێردراوی اللَّه { چ کەسێک خۆشەویسترین کەسە لەلات ؟ فەرمووی عائیشە، وتم لە

پیاوان؟ فەرمووی باوکی عائیشە ( ئەبووبەکری صدیق) وتم ئەی لەپاشان کێ؟ : فەرمووی : عومەری کوڕی خەتاب }

➢ دایە عائیشە خێزانی پێغەمبەرە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە دونیاو قیامەت دا

قَالَ عَمَّارُ بْنُ يَاسِرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ { **وَاللَّهِ إِنَّهَا لَزَوْجَةُ نَبِيِّكُمْ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ** } رواه البخاري

واتای فەرموودەکە: لە عەمماری کوڕی یاسرەوە فەرموویەتی { سوێند بە اللَّه بێگومان عائیشە خێزانی پێغەمبەرتانە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە دونیاو قیامەت دا }

➢ لە گەورەیی دایکمان عائیشەیە کە جبریل سەلامی بۆ دەنێرێت بە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمًا { **يَا عَائِشَ، هَذَا جِبْرِيلُ يُقْرِئُكِ السَّلَامَ " فَقُلْتُ : وَعَلَيْهِ السَّلَامُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ** } مُتَّفَقٌ عليه

واتای فەرموودەکە: لە دایە عائیشەوە اللَّه تَعالَى لێی ڕازی بێت فەرمووی: پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ڕۆژێک فەرمووی { ئەی عائیش ئەوە جبریلە سەلامت لێ ئەکات، جا منیش وتم وَعَلَيْهِ السَّلَامُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ }

- له گه‌وره‌یی دایکمان عائیشـــه‌یه پێغه‌مبه‌رمان صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَــلَّمَ له‌سه‌ری وی و له ماڵی وی و له‌سه‌ر سینگی وی وه‌فات ده‌كات، وه له‌ماڵی ویش دا نێژراوه

**أَنَّ عَائِشَــةَ كَانَتْ تَقُولُ { إِنَّ مِنْ نِعَمِ اللَّهِ عَلَيَّ أَنَّ رَسُــولَ اللَّهِ صَــلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تُوُفِّيَ فِي بَيْتِي، وَفِي يَوْمِي، وَبَيْنَ سَحْرِي وَنَحْرِي، وَأَنَّ اللَّهَ جَمَعَ بَيْنَ رِيقِي وَرِيقِهِ عِنْدَ مَوْتِهِ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ**

واتـای فه‌رمووده‌كه: بێگومـان دایه عـائیشـــه ده‌یفه‌رمو { به‌ڕاســتی له به‌خشـشـه‌كانی اللَّه تَعالَى به‌سـه‌رمه‌وه ئه‌وه‌یه پێغه‌مبه‌ر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ له ماڵی مندا و له‌ڕۆژی مندا وه‌فاتی كردووه، وه له‌نێوان سییه‌كانم و سه‌ره‌وه‌ی سـینگم - واتـا له‌ســه‌ر ســینگی- ، وه بێگومـان اللَّه تَعـالَى لیكی من و لیكی پێغه‌مبه‌ری كۆكردەوه له‌كاتی مردنی دا }

- خه‌ڵكی له ڕۆژی عائیشـه‌دا دیاریان بۆ پێغه‌مبه‌ر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ ده‌هێنا چونكه ده‌یانزانی پێغه‌مبه‌ر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ دڵی پێ خۆش ده‌بێت

**عَنْ عَائِشَـةَ { أَنَّ النَّاسَ كَانُوا يَتَحَرَّوْنَ بِهَدَايَاهُمْ يَوْمَ عَائِشَـةَ ؛ يَبْتَغُونَ بِذَلِكَ مَرْضَاةَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ**

واتای فەرموودەکە: لە دایە عائیشـــەوە { بێگومان خەڵکی بەدوای ئەوەبوون هەدیە و دیارییەکانیان لە ڕۆژی عائیشـــە بێت، مەبەســـتیشـــیان بەوە تەنها ڕەزامەندی و دڵخۆش بوونی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بوو }

➢ پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ دەیزانی هەرکاتێک دایە عائیشـــە لێی توڕەیە یان نا

عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ : قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ { **إِنِّي لَأَعْلَمُ إِذَا كُنْتِ عَنِّي رَاضِيَةً، وَإِذَا كُنْتِ عَلَيَّ غَضْبَى " قَالَتْ : فَقُلْتُ : وَمِنْ أَيْنَ تَعْرِفُ ذَلِكَ ؟ قَالَ : أَمَّا إِذَا كُنْتِ عَنِّي رَاضِـيَةً، فَإِنَّكِ تَقُولِينَ : لَا وَرَبِّ مُحَمَّدٍ. وَإِذَا كُنْتِ غَضْـبَى، قُلْتِ : لَا وَرَبِّ إِبْرَاهِيمَ " قَالَتْ : قُلْتُ : أَجَلْ وَاللَّهِ يَا رَسُـولَ اللَّهِ، مَا أَهْجُرُ إِلَّا اسْمَكَ** } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واتای فەرموودەکە: لە دایە عائیشـەوە فەرموویەتی: پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی پێم { بێگومان من دەزانم هەرکاتێک تۆ لێم ڕازی وە هەرکاتێک تۆ لێم توڕەیت، عائیشـــە فەرمووی : جا وتم: لەکوێوە ئەوە دەزانی؟ پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ فەرمووی : هەرکاتێک لەمن ڕازی بیت و توڕەنەبی دەڵێی نەخێر ســـوێند بە پەروەردیگاری موحەممەد، وە ئەگەر توڕەبی لێم دەڵێی : نەخێر سوێند بە پەروەردیگاری ئیبراهیم، عائیشـە فەرمووی: وتم بەڵێ سوێند بە اللَّه وایە ئەی نێردراوی اللَّه، تەنها ناوەکەی تۆ واز لێ دەهێنم }

## ٧. فەزڵی فاطیمەی کچی رَسُولُ اللّٰهﷺ

قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

{ فَاطِمَةُ بَضْعَةٌ مِنِّي، فَمَنْ أَغْضَبَهَا أَغْضَبَنِي } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واتای فەرموودەکە // پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی {فاتیمە پارچەیەکە لەمن بۆیە هەر کەسێک فاتیمەی تورە کرد ئەوە منی تورە کردووە }

### واتای وشەکان

فَاطِمَةُ = فاتیمەی کچی پێغەمبەر

بَضْعَةٌ = بەشێکە ، پارچەیەکە، پارچە گۆشتێکە، دەخوێنرێتەوە بَضْعَةٌ ، بِضْعَةٌ، بُضْعَةُ

مِنِّي = لەمن

فَمَنْ = جا هەرکەسێک

أَغْضَبَهَا = فاتیمە تورە بکات، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ فَاطِمَةُ

أَغْضَبَنِي = منی تورە کردووە، پێغەمبەری تورەکردووە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

## چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١– ئەم فەرموودەیە ئەو پەڕی ڕێز و گەورەیی فاطیمەی تێدایە بەشێوەیەک پارچەیەکە لە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

٢– فَمَنْ أَغْضَبَهَا أَغْضَبَنِي، السهيلي ئەمە دەکاتە بەڵگە لەسەر ئەوەی هەرکەسێک جوێن بدات بە فاطیمە کافر دەبێت

٣– ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ ئەوەی باوک لەسەر کچەکەی بە وەڵام بێت لەوکاتەی کچەکەی شتێکی پێ ناخۆشە بە تایبەت بەرامبەر پیاوەکەی

٤– هۆکاری ئەو فەرموودەیە ئەوەبوو پێشەوا عەلی ویستی کچی ئەبو جەهل بەسەر فاطیمەی کچی پێغەمبەر بێنێت

٥– لەم فەرموودەیەدا ئەو پەڕی سۆزو خۆشەویستی باوکایەتی تێدایە بەرامبەر بە مناڵەکانی

# کورتەیەک لە ژیانی خوشکی بەڕێزمان فاطیمەی کچی رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

ناوی فاطیمەیە و کچی موحەممەدی کوڕی عبداللّٰه ی کوڕی عبد المطلب یە، ناوی دایکی خەدیجەی کچی خوەیلدە، کونییەکەی بریتییە لە أُمُّ أَبِيهَا، لەقەب و نازناوی زەهرایە، لە هەموو کچەکانی پێغەمبەر بچووکتر بووە، وە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فاطیمەی لە هەموو منداڵەکانی خۆشتروویستووەو لەهەمووان زیاتر ڕێزی گرتووە، پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کاتێک لەسەفەر دەهاتەوە دەچووە مزگەوت و دوو ڕەکعەت سوننەتی دەکرد و پاشان دەچووە لای فاطیمە و هەواڵی دەپرسی پاشان دەگەڕا بەسەر خێزانەکانی دا، فاطیمە سەرداری ئافرەتانی دونیایە، لەتەمەنی ١٥ ساڵیدا مێردی کردووە بە پێشەوا عەلی کوڕی ئەبووتالیب، منداڵەکانی فاطیمە ناویان حەسەن و حوسێن و أم کلثوم و زەینەب بووە، هەموو منداڵەکانی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە پێشە خۆی دا وەفاتیان کردووە جگە لە فاطیمە نەبێ شەش مانگ دوای پێغەمبەر وەفاتی کردووە، هەروەک إبن أبي العز الحنفي دەڵێت:

وَالكُلُّ فِي حَياتِهِ ذَاقُوا الحِمامْ

وَبَعدَهُ فَاطِمَةُ بِنِصْفِ عامْ

واتا: هەموو منداڵەکانی لەژیانی خۆیدا تامی مردنیان کرد، وە لەدوای مردنی پێغەمبەر فاطیمە وەفاتی کرد بە شەش مانگ، وتراوە لە ٣٠ ساڵی دا وەفاتی

کردووه وه وتراوه له ٣٥ ساڵی دا وەفاتی کردووه و لەپاشان پێشەوا عەلی شۆریویەتی و پێشەوای عەبباسی مامی نوێژی لەسەرکردووه و عەبباس و عەلی و فەضل لەناو گۆڕیان ناوه، گۆڕەکەی پر بێت لەنوور کچه نازدار و خۆشەویستەکەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

## گەورەیی خوشکمان فاطیمە لە چەند فەرموودەیەکی تری صەحیح دا

- لەفەزڵ و گەورەیی فاطیمه ئەوەیه پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هەواڵی پێ ئەدات کەوا گەورەی ئافرەتانی بەهەشته

وَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ { **فَاطِمَةُ سَيِّدَةُ نِسَاءِ أَهْلِ الْجَنَّةِ** } رواه البخاري في معلقاته

واتای فەرموودەکه { فاطیمه گەورەی ئافرەتانی ئەهلی بەهەشته }

- پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەسەره مەرگ به فاطیمەی فەرموو:

{ **أَلَا تَرْضَيْنَ أَنْ تَكُونِي سَيِّدَةَ نِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ، أَوْ سَيِّدَةَ نِسَاءِ هَذِهِ الْأُمَّةِ ؟ " فَضَحِكْتُ لِذَلِكَ** } مُتَّفَقٌ عَليه

واتای فەرموودەکه { ئایا تۆ ڕازی نابیت ببیته گەورەی ئافرەتانی ئیماندار ؟ یان گەورەی ئافرەتانی ئەم ئوممەته؟ فاطیمه دەڵێت جا پێکەنیم و دڵم خۆش بوو بەوه - بەو موژدەیه - }

➤ پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حەزناکات و پێی ناخۆشە ژن بەسەر فاطیمەی کچی بهێندرێت

عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ قَالَ { إِنَّ عَلِيًّا خَطَبَ بِنْتَ أَبِي جَهْلٍ، فَسَمِعَتْ بِذَلِكَ فَاطِمَةُ، فَأَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَتْ : يَزْعُمُ قَوْمُكَ أَنَّكَ لَا تَغْضَبُ لِبَنَاتِكَ، وَهَذَا عَلِيٌّ نَاكِحٌ بِنْتَ أَبِي جَهْلٍ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَسَمِعْتُهُ حِينَ تَشَهَّدَ يَقُولُ : أَمَّا بَعْدُ، أَنْكَحْتُ أَبَا الْعَاصِ بْنَ الرَّبِيعِ، فَحَدَّثَنِي، وَصَدَقَنِي، وَإِنَّ فَاطِمَةَ بَضْعَةٌ مِنِّي، وَ إِنِّي أَكْرَهُ أَنْ يَسُوءَهَا، وَاللَّهِ لَا تَجْتَمِعُ بِنْتُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَبِنْتُ عَدُوِّ اللَّهِ عِنْدَ رَجُلٍ وَاحِدٍ " فَتَرَكَ عَلِيٌّ الْخِطْبَةَ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واتای فەرموودەکە: لە میسوەری کوڕی مەخرەمەوە فەرموویەتی { بەڕاستی عەلی کوڕی ئەبووتالیب چووە خوازبێنی کچی ئەبو جەهل، جا فاطیمە گوێی لەوە بوو، جا هاتە لای پێغەمبەری اللَّه ، جا فاطیمە فەرمووی گەلەکەت وا گومان دەبەن تۆ لەسەر کچەکانت توڕەنابی ، ئەوە عەلی دەیەوێت کچی ئەبو جەهلی بخوازێت، جا پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هەستا، میسوەری کوڕی مەخرەمە دەفەرمووێ جا گوێم لێ بوو لەوکاتەی شایەتومانی هێناو فەرمووی ئەمما بەعد ، بێگومان من کچم ( زەینەبم )دایە ئەبو العاص ی کوڕی ڕەبیع وادەی پێدام ( ژنی بەسەر نەهێنی ) ڕاستی کرد لەگەڵم، بەڕاستی فاطیمە پارچەیەکە لەمن، وە بێگومان من پێم ناخۆشە توشی ناخۆشی و ناڕەحەتی ببێت ، سوێند بە اللَّه کۆنابێتەوە کچی پێغەمبەری اللَّه و کچی دوژمنی اللَّه لەلای یەک پیاو، جا پێشەوا عەلی کوڕی ئەبووتالیب وازی لە خوازبێنییەکە هێنا }

## ٨. گەورەیی زەینەبی کچی جەحش

عَـنْ زَيْنَـبَ بِنْـتِ جَحْـشٍ رَضِـيَ اللَّهُ عَنْهَـا قَالَـتْ { زَوَّجَكُـنَّ أَهْلُـوكُنَّ وَزَوَّجَنـيِ اللَّهُ مِـنْ فَـوْقِ سَـبْعِ سَـمَاوَاتٍ } رواه الترمـذي والبخـاري وغيرهما واللفظ للترمذي

**واتای فەرموودەکە**: لە زەینەبی کچی جەحشەوە ــــ وەکو شانازی کردن لەناو هاوســەرانی تری پێغەمبەر صَـلَّی اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ ــــ دەیفەرموو { ئێوە ئەهل و کەس و کارتان مارەی کردوون، وە من اللَّه تَعالَی لەسەرووی حەوت ئاسمانەکانەوە مارەی کردم }

## واتای وشەکان

**زَوَّجَكُنَّ** : مارەی کردوون، ئێوەی مارەکردووە

**أَهْلُوكُنَّ** : کەس و کارتان، أَهْلُون و الأَهَالِي جەمع و کۆنە بۆ وشــەی أَهْل

**وَزَوَّجَنِي** : وە منی مارەکردووە

**اللَّهُ** : اللَّه تَعالَی

**وَزَوَّجَنِي اللَّهُ** : وە اللَّه منی مارکردووە

**مِنْ فَوْقِ** : لەسەرووی

**سَـبْعِ سَـمَاوَاتٍ** : حەوت ئاســمانەکان، سَــمَاوَات جەمع و کۆیە بۆ وشەی سَمَاء

## ۞ چه‌ند سوودێک له‌م فه‌رمووده‌یه‌دا

١ – زه‌ینه‌بی کچی جه‌حش فه‌خر و شـــانـازی به‌خۆیه‌وه ده‌کـات که‌وا اللَّه له‌ســه‌رووی حه‌وته‌م ته‌به‌قه‌ی ئاســمانه‌وه ماره‌ی کردووه له پێغه‌مبه‌ر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

٢ – ئه‌و فه‌رمووده‌یه به‌ڵگه‌یه بۆ فه‌زڵ و گه‌وره‌یی دایکمان زه‌ینه‌ب له‌لای اللَّه تَعالَى ى

## کورته‌یه‌کـــ له ژیانی دایکی خۆشه‌ویستمان زه‌ینه‌بی کچی جه‌حش

ناوی زه‌ینه‌به کچی جه‌حشـی کوڕی ڕیئابه، خێزانی زه‌یدی کوڕی حاریثه بووه و ته‌ڵاقی داوه، له ته‌مه‌نی ٣٥ ســاڵی دا شــووی کردووه به پێغه‌مبه‌ر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ئافره‌تێکی خاوه‌ن چاکه بووه و زۆر سه‌خی و ده‌ست کراوه بووه، زه‌ینه‌بی کچی جه‌حش یه‌که‌م خێزانی پێغه‌مبه‌ره وه‌فات بکات له‌دوای وه‌فاتی پێغه‌مبه‌ره‌وه صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ، زه‌ینه‌ب وه‌فاتی کردووه له‌ســه‌رده‌می پێشه‌وا عومه‌ری کوڕی خه‌تاب دا له ساڵی ٢٠ ی کۆچی ، له ته‌مه‌نی ٥٠ ساڵی دا به‌ڵام عومه‌ری کوڕی عوثمان ده‌ڵێت له ٥٣ ساڵی دا وه‌فاتی کردووه

## گەورەیی دایکمان زەینەبی کچی جەحش لە فەرموودەیەکی تری صەحیح دا

➤ عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ، قَالَتْ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

**{ أَسْرَعُكُنَّ لَحَاقًا بِي أَطْوَلُكُنَّ يَدًا " قَالَتْ : فَكُنَّ يَتَطَاوَلْنَ أَيَّتُهُنَّ أَطْوَلُ يَدًا، قَالَتْ : فَكَانَتْ أَطْوَلَنَا يَدًا زَيْنَبُ ؛ لِأَنَّهَا كَانَتْ تَعْمَلُ بِيَدِهَا وَتَصَدَّقُ }** مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ واللفظ لمسلم

واتای فەرموودەکە: لە دایە عائیشەی دایکی بڕوادارانەوە فەرموویەتی: پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی { خێراترینتان لەوەی بگەن بە من– لەدوای من بمرێت – دەست درێژترینتانە، عائیشە فەرمووی: خێزانەکانی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەستیان درێژکرد تا بزانن کامیان لە هەموویان دەستی درێژترە، عائیشە فەرمووی: زەینەب دەستی لە هەمووماں درێژتربوو، لەبەر ئەوەی بە دەستی خۆی کاری دەکرد و لێی دەبەخشی و سەدەقەی پێ دەکرد } زەینەب لە پێش هەموو خێزانەکانی تری پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وەفاتی کرد، مەبەست لەدەست درێژییەکەش دەست درێژی کردنە بە خێر و چاکە کردن بۆیەش زەینەب پێش هەموویان بە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ گەیشت والله أعلم

## ٩. گەورەیی حەسەنی کوڕی عەلی

عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رَضِـيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: رَأَيْتُ الْحَسَـنَ بْنَ عَلِيٍّ عَلَى عَاتِقِ النَّبِيِّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ، وَهُوَيَقُولُ { اللَّهُمَّ إِنِّي أُحِبُّهُ فَأَحِبَّهُ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

**واتـای فەرموودەکە**: لەبەڕائی کوڕی عـازیبەوە اللَّه تَعـالَى لێ ڕازی بێت، فەرموویەتی حەسـەنم بینی لەسـەر شـانی پێغەمبەر بوو صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ ، وە پێغەمبەر دەیفەرموو { ئەی اللَّه تَعالَى بەڕاسـتی من حەسەنم خۆش دەوێت و تۆش خۆشت بووێت }

### واتـای وشەکـان

**رَأَيْتُ الْحَسَنَ بْنَ عَلِيٍّ** : حەسەنی کوڕی عەلیم بینی

**رَأَيْتُ** : دیتم، بینیم

**عَلَى عَاتِقِ النَّبِيِّ** : لەسەر شانی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

**عَاتِق** : شان

**وَهُوَيَقُولُ** : وە پێغەمبەر دەیفەرموو

**اللَّهُمَّ** : ئەی اللَّه تَعالَى

**إِنِّي** : بێگومان من

**أُحِبُّهُ** : حەسەنم خۆش دەوێت، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ الْحَسَن

**فَأَحِبَّهُ** : جا تۆش خۆشت بوێت، تۆش حەسەنت خۆش بوێت، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ الْحَسَن

## ۞ چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١– ئەو فەرموودەیە ئەوپەڕی سۆز و خۆشەویستی پێغەمبەرە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بۆ منالان

٢– ئەم فەرموودەیە فەزڵ و گەورەیی پێشەوا حەسەنی تێدایە

٣– لەم فەرموودەیەدا فێر دەبین دوعا و پاڕانەوەی چاک و باش بکەین بۆ منالان بەتایبەت بۆ منالی خۆت یان منالی منالەکانت

# کورتەیەک لە ژیانی پێشەوا حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبووتالیب

ناوی حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبووتالیبە، دایکی ناوی فاطیمەی کچی موحەممەدە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، نەوەی پێغەمبەرە، کونییەکەی بریتییە لە أَبُو مُحَمَّد، لەساڵی سێیەمی کۆچی لە دایک بووە، پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ناوی لێناوە، پێشەوا حەسەن گەورەی بڕواداران بووە لەدوای وەفاتی باوکی بەڵام تەنازولی کردووە لە خەلیفایەتی لەبەر پێشەوا موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان، پێشەوا حەسەن لە ساڵی ٤٩ ی کۆچی دا وەفاتی کردووە و وتراوە ژەهر خواردیان کردووە

## گەورەیی پێشەوا حەسەن لە چەند فەرموودەیەکی تری صەحیح دا

- لە گەورەیی پێشەوا حەسەنی کوڕی پێشەوا عەلی ئەوەیە لەهەموو کەسێک زیاتر بە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ چووە

عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ { **لَمْ يَكُنْ أَحَدٌ أَشْبَهَ بِالنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ** } مُتَّفَقٌ عَليه

واتای فەرموودەکە: لە ئەنەسەوە فەرموویەتی { هیچ کەسێک لە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نەدەچوو بەقەد ئەوەی حەسەنی کوڕی عەلی بە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەچوو}

➢ عَنْ عُقْبَةَ بْنِ الْحَارِثِ ، قَالَ :

{ **رَأَيْتُ أَبَا بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ وَحَمَلَ الْحَسَنَ وَهُوَ يَقُولُ : بِأَبِي شَبِيهٌ بِالنَّبِي لَيْسَ شَبِيهٌ بِعَلِي وَعَلِيٌّ يَضْحَكُ** } رواه البخاري

واتای فەرموودەکە: لە عوقبەی کوڕی حارثەوە فەرموویەتی { أبوبکرم بینی کە حەسەنی هەڵگرت و دەیفەرموو: باوکم بە فیدای بێت، ئەمە هاوشێوەی پێغەمبەرە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، هاوشێوەی عەلی نییە، وە عەلی پێدەکەنی }

➢ پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ پێشەوا حەسەنی بە کەسێکی گەورە و کوژێنەرەوەی کێشە وەسف کردووە

عَنْ أَبِى بَكْرَةَ قَالَ، سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الْمِنْبَرِ وَالْحَسَنُ إِلَى جَنْبِهِ يَنْظُرُ إِلَى النَّاسِ مَرَّةً وَإِلَيْهِ مَرَّةً، وَيَقُولُ { **ابْنِي هَذَا سَيِّدٌ، وَلَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يُصْلِحَ بِهِ بَيْنَ فِئَتَيْنِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ** } رواه البخاري و غيره

واتای فەرموودەکە: لە ئەبو بەکرەوە، فەرموویەتی{ گوێم لە پێغەمبەر بوو صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەسەر مینبەر وە حەسەن لە تەنیشتیەوە بوو، جارێک سەیری خەڵکی دەکرد و جارێک سەیری حەسەنی دەکرد و دەیفەرموو( ئەوکوڕەی من سەید و گەورەیە، وە ئومێدەوارم کە الله بەهۆی ئەوەوە ئاشتەوایی بخاتە نێوان دوو کۆمەڵ لە مسڵمانان }

## ١٠. پێشەوا حوسەینی کوڕی عەلی

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

{ إِنَّ الْحَسَنَ وَالْحُسَيْنَ هُمَا رَيْحَانَتَايَ مِنَ الدُّنْيَا } رواه البخاري و أحمد و الترمذي واللفظ له

**واتای فەرموودەکە**: پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی { بەڕاستی حەسەن و حوسەین هەردووکیان دوو چڵە ڕەیحانی منن لە دونیادا }

### واتای وشەکان

**إِنَّ** : بێگومان

**الْحَسَنَ** : حەسەنی کوڕی عەلی

**وَالْحُسَيْنَ** : حوسێنی کوڕی عەلی

**هُمَا** : هەردووکیان، حەسەن و حوسەین

**رَيْحَانَتَايَ** : دوو چڵە ڕەیحانی منن، ڕەیحان جۆرە ڕووەکێکی بۆن خۆشە، ڕەیحان بەواتای ڕەحمەت و ڕزقیش دێت

**مِنَ الدُّنْيَا** : لە دونیا

## چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١– ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر گەورەیی پێشەوا حوسەینی کوڕی عەلی

٢– شانازی کردنی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بە نەوەکانی خۆی

٣– سۆزو خۆشەویستی پێغەمبەر بۆ نەوەکانی خۆی

## کورتەیەک لە ژیانی پێشەوا حوسەینی کوڕی عەلی

ناوی تەواوی بریتییە لە حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبووتالیبی کوڕی عەبدول موطەلیب، نەوەی پێغەمبەرە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، حوسەین لەگەڵ باوکی هەر لە مەدینەدا نیشتەجێ بوو تا ئەو کاتەی لەگەڵی دا چووە کوفە، ئامادەی شەڕی جەمەل و صەفین و شەڕی خەواریج بووە، پێشەوا حوسەین کەسێکی خاوەن عیبادەتی زۆربوو لە نوێژ و ڕۆژوو و حەجکردن دا، موصعەبی الزبيري دەڵێت پێشەوا حوسەین ٢٥ جار بە پێیان حەجی کردووە، پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زۆری خۆشویستووە، پێشەوا حوسەین لە ساڵی ٦١ ی کۆچی دا زۆر بە مەزڵومانە دەکوژرێ لە کەربەلا لە تەمەنی ٥٨ ساڵی دا

## ١١. جەعفەری کوڕی ئەبووتالیب

عَـنِ الْبَـرَاءِ بْـنِ عَـازِبٍ ، أَنَّ النَّبِـيَّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قَـالَ لِجَعْفَـرِبْـنِ أَبِي طَالِـبٍ{ أَشْـبَهْتَ خَلْقِـي وَخُلُقِـي } رواه البخـاري و الترمذي وغيرهما

**واتای فەرموودەکە:** لە بەڕائی کوڕی عازیبەوە ، بێگومان پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ بەجەعفەری کوڕی ئەبووتالیبی فەرموو { تۆ لە شـێوەی من دەچی هەم لە جەسـتەو ڕوخسـاردا هەمیش لە ڕەوشـت و ئاکاردا }

### واتای وشەکان

**قَالَ** : فەرمووی ( پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ )

**لِجَعْفَرِبْنِ أَبِي طَالِبٍ** : بە جەعفەری کوڕی ئەبووتالیب

**أَشْبَهْتَ** : تۆ لێکچووی، پێکچووی

**خَلْقِي** : شێوەی من، وێنەی من، خۆی خَلْق مەصدەرە بەواتای مفعول دێ، واتا خَلْق بەواتای مَخْلوق دێت، مَخْلوق واتا دروستکراو

**خُلُقِي** : خوو و ڕەوشتی من، ئاکاری من

## چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١ – ئەم فەرموودەیە گەورەیی پێشەوا جەعفەری تێدایە

٢ – گەورەییە بۆ جەعفەر لە ڕەوشتی بە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بچێت ، چونکە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جوانترین ڕەوشتی هەبووە

٣– ڕوخساری پێشەوا جەعفەر زۆر جوان بووە چونکە بە پێغەمبەر دەچێت، بە بێگومانیش پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جوانترین کەس بووە

## کورتەیەک لە ژیانی پێشەوا جەعفەری کوڕی ئەبووتالیب

ناوی جەعفەری کوڕی ئەبووتالیب ی کوڕی عبد المطلب یە ، ئامۆزای پێغەمبەرە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، برای پێشەوا عەلی کوڕی ئەبووتالیبە، بەخۆیی و ئەسمای خێزانی کۆچیان کردووە هەم بۆ حەبەشە هەم بۆ مەدینە، کەسێکی زۆر سەخی و دەست کراوە بووە بۆیە ناوی لێنرابوو باوکی فەقیران، لەشەڕی موئتە ئاڵای ئیسلامی بەدەستەوەبوو جا جەنگا تا دەستی ڕاستەی لێکراوە لە ناو شەڕدا، جا ئاڵایەکەی بەدەستی چەپی هەڵگرتەوە و جەنگا تا دەستی چەپەشیان لێکردەوە، هەر لەم شەڕەش دا شەهیدکرا لە ساڵی هەشتی کۆچی دا

## گەورەیی پێشـــەوا جەعفەر لە چەنـد فەرموودەیەکی تری صەحیح دا

➢ لەگەورەیی جەعفەر ئەوەیە کەسێکی زۆر باش بوو بۆ فەقیر و هەژاران

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِـيَ اللَّهُ عَنْـهُ { **وَكَانَ أَخْيَرَ النَّاسِ لِلْمِسْــكِينِ جَعْفَرُ بْنُ أَبِي طَالِبٍ**} رواه البخاري

واتـای فەرموودەکە: لە ئەبوو هورەیرەوە اللَّه تَعـالَى لێی ڕازی بێـت { چـاکترین کەس بۆ فەقیر و هەژاران جەعفەری کوڕی ئەبووتالیب بوو }

➢ پێشـــەوا جەعفەر نـاوی نرابوو خـاوەن دوو بـاڵەکە، لەجێی ئەو دوو دەستەی لەشەڕ بڕدرابوو دوو باڵی پێ بەخشرا

أَنَّ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا كَانَ إِذَا سَلَّمَ عَلَى ابْنِ جَعْفَرٍ قَالَ { **السَّلَامُ عَلَيْكَ يَا ابْنَ ذِي الْجَنَاحَيْنِ** } رواه البخاري

واتاکەی: بەڕاسـتی پێشـەوا عبداللَّه ی کوڕی عومەر ئەگەر سـەلامی لە کوڕی جەعفەر بکردایە دەیفەرموو { سـەلام لەسـەر تۆ بێت ئەی کوڕی خاوەن دوو باڵەکە }

## ١٢. ئەبوو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

{ لِكُلِّ أُمَّةٍ أَمِينٌ، وَأَمِينُ هَذِهِ الْأُمَّةِ أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ } مُتَّفَقٌ عَليه

**واتای فەرموودەکە** { بۆ هەموو ئوممەتێک ئەمین و دەستپاکێک هەیە، وە ئەمین و دەستپاکی ئەم ئوممەتەی من ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاحە }

## واتای وشەکان

**لِكُلِّ** : بۆ هەموو

**أُمَّةٍ** : ئوممەتێک

**أَمِينٌ** : ئەمینێک، دەستپاکێک ( هەیە )

**وَأَمِينُ** : وە ئەمین و دەستپاکی

**هَذِهِ الْأُمَّةِ** : ئەو ئوممەتە

**أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ** : ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاحە

## چه‌ند سوودێک له‌م فه‌رمووده‌یه‌دا

١– ئه‌م فه‌رمووده‌یه به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر گه‌وره‌یی پێشه‌وا عوبه‌یده‌ی كوڕی جه‌رڕاح

٢– چ فه‌زڵێكی گه‌وره‌یه له‌ناو هه‌موو ئوممه‌ت ئه‌بوو عوبه‌یده تایبه‌ت كراوه به ئه‌مین و ده‌ستپاكی ئوممه‌ت

٣–وه‌ك چۆن ئه‌و ئوممه‌ته ئه‌مین و ده‌ستپاكێكی تایبه‌تی هه‌بووه ئوممه‌ته‌كانی تریش به‌هه‌مان شێوه هه‌یان بووه

## کورتەیەک لە ژیانی پێشەوا ئەبوو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح

ناوی عامری کوڕی عبداللَّەی کوڕی جەڕڕاحی کوڕی هیلالە، دایکی مسولْمان بووە، بەڵام باوکی بە کافری کوژراوە لەشەڕی بەدردا، وە وتراوە خۆی باوکی خۆی کوشتووە لەم شەڕەدا، پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب ئەبو عوبەیدەی کردبووە ئەمیر بەسەر شامەوە، لەسەر دەستی ئەبو عوبەیدە وڵاتی شام فەتح کرا و گەنجینە و دەست کەوت و خێرێکی زۆری کۆکردەوە بۆ بيت المال، ڕۆژێک پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب چووە ماڵی هیچ شتێکی نەبینی لەماڵەکەی دا هەبێ جگە لە سیلاحەکەو کەل و پەلی وڵاغەکەی جا پێشەوا عومەر گریا و فەرمووی واللە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ڕاستی فەرموو کە تۆ ئەمین و دەستپاکی ئەو ئوممەتەی، ئەبو عوبەیدە وەفاتی کرد لە ساڵی هەژدەی کۆچی بەنەخۆشی طاعون بە کۆدەنگی زانایان

لە فەرموودەیەکی تردا بەم شێوەیە هاتووە

**عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ { أَنَّ أَهْلَ الْيَمَنِ قَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالُوا : ابْعَثْ مَعَنَا رَجُلًا يُعَلِّمْنَا السُّنَّةَ وَالْإِسْلَامَ. قَالَ : فَأَخَذَ بِيَدِ أَبِي عُبَيْدَةَ، فَقَالَ : هَذَا أَمِينُ هَذِهِ الْأُمَّةِ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ**

واتای فەرموودەکە: لە ئەنەسەوە اللَّه تَعالَى لێی ڕازی بێت فەرموویەتی {بێگومان ئەهلی یەمەن هاتنە لای پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جا وتیان پیاوێک لەگەڵ ئێمە بنێرە تا سووننەت و ئیسلاممان فێربکات، جا پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەستی ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاحی گرت پاشان فەرمووی ئەوە ئەمین و دەستپاکی ئەو ئوممەتەیە( پێشەوا عوبەیدەی لەگەڵیان نارد ) }

## ١٣. سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص

عَـنْ عَلِيٍّ رَضِـيَ اللَّهُ عَنْـهُ قَـالَ { مَـا سَـمِعْتُ النَّبِـيَّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ جَمَـعَ أَبَوَيْـهِ لِأَحَـدٍ إِلَّا لِسَـعْدِ بْـنِ مَالِـكٍ ؛ فَـإِنِّي سَـمِعْتُهُ يَقُولُ يَوْمَ أُحُدٍ : يَا سَعْدُ، ارْمِ فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

**واتـای فەرموودەکە**: لە عەلی ـــــــیەوە اللَّه تَعـالَى لێی ڕازی بێـت فەرموویەتی { گوێم لە پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ نەبووە فیدای هیچ کەسـێکی بکات دایک و باوکی بەیەکەوە جگە لە سـەعدی کوڕی مالیک نەبێت، جا بێگومان من گوێم لە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بوو لەڕۆژی جەنگی ئوحود دەیفەرموو: ئەی سـەعـد، ڕم بهاوێژە بەفیدای تۆ بن باوکم و دایکم }

### واتای وشەکان

**مَا سَمِعْتُ** : گوێم لێ نەبووە، نەمبیستووە

**النَّبِيَّ** : لە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

**جَمَعَ** : کۆبکاتەوە، خۆی جَمَعَ کاری ڕابردووە و بەواتای کۆیکردەوە دێت

أَبَوَيْهِ : باوک و دایکی، ئەو هائە بۆ وشەی النَّبِيَّ دەگەڕێتەوە

لِأَحَدٍ : بۆ کەسێک، بۆ هیچ کەسێک

إِلَّا : تەنها، جگە، بێجگە

لِسَعْدِ بْنِ مَالِكٍ : بۆ سەعدی کوڕی مالیک نەبێت

فَإِنِّي : جا بەڕاستی من

سَمِعْتُهُ : گوێم لە پێغەمبەر بوو، ئەو هائە بۆ النَّبِيّ دەگەڕێتەوە

يَقُولُ : دەیفەرموو

يَوْمَ أُحُدٍ : لە ڕۆژی ئوحود، لە جەنگی ئوحود

يَا سَعْدُ : ئەی سەعد

ارْمِ : بهاوێژە، ڕم بهاوێژە

فِدَاكَ : فیدای تۆ بن، فیدات بێت

أَبِي : باوکم

وَأُمِّي : وە دایکم

## ۞ چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١ – ئەمە گەورەییە بۆ سـەعدی کوڕی ئەبو وەقاص، چونکە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دایک و باوکی خۆی بە فیدا کردووە

٢ – ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسـەر گەورەیی تیر هـاوێشـتن و هـانـدان لەسەری و دوعا کردن بۆ ئەو کەسەی دەیهاوێژێت

٣ – دروستییەتی بەفیداکردنی دایك و باوك

## باسێکی کورت لەسەرپێشەوا سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص

ناوی سـەعدی کوڕی مالیکی کوڕی وهەیبی کوڕی عەبدو مەنافە، کونییەکەی بریتییە لە أَبُو إِسْحاق، هەر لەسەرەتاوە مسوڵمان بووە لەسەر دەستی ئەبوبەکری صدیق لە تەمەنی ١٧ سـاڵی دا، وە یەکەم کەس بووە تیری هاوێشتووە لە پێناو اللَّه تَعالَى دا، خزمەتێکی زۆری ئەم دینە جوانەی کردووە، یەک لەو کەسانە بووە هەر لە دونیا دا موژدەی بەهەشتیان پێدراوە، لەماڵەکەی خۆی دا وەفات دەکات و مەڕوانی کوڕی حەکەم نوێژی لەسـەر دەکات، مەڕوان ئەوکات والی مەدینە بوو، لە پاشان خێزانەکانی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نوێژی لەسـەر دەکەن، لە گۆڕسـتانی بەقیع نێژراوە لە سـاڵی ٥٥ ی کۆچی، تەمەنی زیاد لە حەفتا ساڵ بوو وە وتراوە لەوکاتەی وەفات دەکات تەمەنی ٨٢ سـاڵ بـووە، ٢٧٠ فەرمـوودەی لێ گـێڕدراوەتەوە، ٣٨ فەرمـوودەیـان لە صەحیحەین دا هاتووە

## گەورەیی سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص لە چەند فەرموودەیەکی تری صەحیح دا

- یەکەم کەس لە پێناو اللَّه تَعالَیٰ تیری هاوێشـــت ســـەعدی کوڕی ئەبو وەقاص بوو

عَنْ سَـعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ يَقُولُ { **وَاللَّهِ إِنِّي لَأَوَّلُ رَجُلٍ مِنَ الْعَرَبِ رَمَى بِسَـهْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ** } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واتای فەرموودەکە: لە ســەعدی کوڕی ئەبو وەقاصــەوە دەیفەرموو { ســوێند بە اللَّه بێگومان من یەکەم پیاوبووم لە عەرەب تیرم هاویشـــتووە لە پێناو اللَّه تَعالَیٰ }

- ســـەعدی کوڕی ئەبو وەقاص پاســـەوانی لە پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کردووە و بە پیاوێکی صاڵح وەصفکراوە

عَنْ عَائِشَـةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ : كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ سَـهِرَ، فَلَمَّا قَدِمَ الْمَدِينَةَ قَالَ { **لَيْتَ رَجُلًا مِنْ أَصْحَابِي صَالِحًا يَحْرُسُنِي اللَّيْلَةَ " إِذْ سَمِعْنَا صَـوْتَ سِـلَاحٍ، فَقَالَ : مَنْ هَذَا ؟ فَقَالَ : أَنَا سَـعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ، جِئْتُ لِأَحْرُسَكَ. وَنَامَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ** } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واتای فەرموودەکە: لە دایە عائیشـــەوە اللَّه تَعالَیٰ لێی ڕازی بێت فەرموویەتی: لەو کاتەی پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـــلَّمَ هاتە مەدینە فەرمووی { خۆزگە پیاوێکی صاڵح لە هاوەڵانم ئەمشـەو پاسـەوانی لێ دەکردم، لەوکاتەدا گوێمان لە دەنگی ســیلاح بوو، جا پێغەمبەر صَــلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـــلَّمَ فەرمووی ئەوە کێیە؟ فەرمووی: من ســـەعدی کوڕی ئەبو وەقاصـــم، هاتوومە بۆ ئەوەی پاسەوانیت لێ بکەم. جا پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خەوت }

## ١٤. پێشه‌وا زوبه‌یری کوڕی عه‌وام

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

{إِنَّ لِكُلِّ نَبِيٍّ حَوَارِيًّا ، وَإِنَّ حَوَارِيَّ الزُّبَيْرُبْنُ الْعَوَّامِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

**واتای فەرموودەکە** {بەڕاستی بۆ هەموو پێغەمبەرێک هاوەڵێکی تایبەت و سەرخەر هەیە، وە بەڕاستی هاوەڵی تایبەت و سەرخەری من زوبەیری کوڕی عەوامە}

## واتای وشەکان

**إِنَّ** : بەڕاستی، بێگومان

**لِكُلِّ** : بۆ هەموو

**نَبِيٍّ** : پێغەمبەرێک

**حَوَارِيًّا** : سەرخەرێک، تایبەتێک

**وَإِنَّ** : وە بەڕاستی و بێگومان

**حَوَارِيَّ** : سەرخەری من ، تایبەتی من

**الزُّبَيْرُبْنُ الْعَوَّامِ** : زوبەیری کوڕی عەوامە

## چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١– ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر فەزڵ و گەورەیی زوبەیری کوڕی عەوام

٢– هەموو پێغەمبەرێک کەسێکی وا تایبەت و سەرخەریان هەبووە

٣– چ فەزڵێکی گەورەیە لەناو هەموو هاوەڵان و ئوممەت زوبەیری کوڕی عەوام تایبەت و سەرخەری پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بێت

## کورتەیەک لە ژیانی پێشەوا زوبەیری کوڕی عەوام

ناوی زوبەیری کوڕی عەوامی کوڕی خوەیلدی کوڕی ئەسەدە، زوبەیر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ مێردی ئەسمای کچی ابوبکر بووە و هاوەڵزاوای پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بووە، دایکی مسوڵمان بووە و ناوی صەفیەی کچی عَبد المطلب بیە و پلکی پێغەمبەرە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، کونییەکەی بریتییە لە أَبُو عَبْدِ اللَّه، زوبەیر لە تەمەنی هەشت ساڵی دا مسوڵمان بووە، دوو جار کۆچ دەکات بەرەو زەوی حەبەشە، یەکەم کەس بووە شمشێری دەرهێناوە لە پێناو اللَّه، لەجەنگی ئوحود بەردەوام بوو لەگەڵ پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و بەیعەتی پێدا تامردن، زوبەری کوڕی عەوام یەکێک بووە لەو کەسانەی لە دونیادا موژدەی بەهەشتیان پێدراوە، لە جەنگی جەمەل دەکوژرێ لە تەمەنی ٧٥ یان ٦٥ ساڵی دا بەدەستی جرموز پاشان هەواڵی مردنی دەگاتە پێشەوا عەلی کوڕی ئەبووتالیب ئەویش دەفەرموێت موژدەی دۆزەخ بدەن بەو کەسەی زوبەیری کوڕی عەوامی کوشتووە، کۆی گشتی ئەو فەرموودانەی گێڕایتییەوە ٣٨ فەرموودەیە، حەوت فەرموودەیان لە صەحیحەین دا هاتووە، واللَّه أعلم

## گەورەیی زوبەیری کوڕی عەوام لە چەند فەرموودەیەکی تری صەحیح دا

➢ زوبەیری کوڕی عەوام لەو کەسانەبوو وەڵامی الله و پێغەمبەری داوەتەوە

عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ قَالَ : قَالَتْ لِي عَائِشَةُ { **أَبَوَاكَ - وَاللَّهِ - مِنَ الَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِلَّهِ وَالرَّسُولِ مِنْ بَعْدِ مَا أَصَابَهُمُ الْقَرْحُ** } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واتاکەی: لە عورِوەی کوڕی زوبەیرەوە فەرموویەتی: دایە عائیشە پێی وتم { سوێند بە الله هەردوو باوەت – ئەبووبەکری صدیق و زوبەیری کوڕی عەوام – لەو کەسانە بوون وەڵامی الله تَعالَى و پێغەمبەریان داوەتەوە دوای ئەوەی توشی کوشتار و بڕین و ئازار هاتن }

➢ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ الْأَحْزَابِ:

{ **مَنْ يَأْتِينَا بِخَبَرِ الْقَوْمِ ؟ فَقَالَ الزُّبَيْرُ: أَنَا. ثُمَّ قَالَ : مَنْ يَأْتِينَا بِخَبَرِ الْقَوْمِ ؟ فَقَالَ الزُّبَيْرُ: أَنَا. ثُمَّ قَالَ : مَنْ يَأْتِينَا بِخَبَرِ الْقَوْمِ ؟ فَقَالَ الزُّبَيْرُ: أَنَا. ثُمَّ قَالَ : إِنَّ لِكُلِّ نَبِيٍّ حَوَارِيًّ ، وَإِنَّ حَوَارِيَّ الزُّبَيْرُ** } رواه البخاري

واتای فەرموودەکە: پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەڕۆژی ئەحزاب دا فەرمووی { کێ بۆمان دەهێنێت هەواڵی ئەو قەومە، زوبەیری کوڕی عەوام فەرمووی من، پاشان پێغەمبەر فەرمووی: کێ بۆمان دەهێنێت هەواڵی ئەو قەومە، زوبەیری کوڕی عەوام فەرمووی من، پاشان پێغەمبەر فەرمووی کێ بۆمان دەهێنێت هەواڵی ئەو قەومە، زوبەیری کوڕی عەوام فەرمووی من، پاشان پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: بەڕاستی بۆ هەموو پێغەمبەرێک هاوەڵێکی تایبەت و سەرخەر هەیە، وە بێگومان سەرخەر و تایبەتی منیش زوبەیری کوڕی عەوامە

## ١٥. گەورەیی طەلحەی کوڕی عُبَیْدُ اللّٰهِ

عَـنْ أَبِـي عُثْمَـانَ ، قَـالَ { لَـمْ يَبْـقَ مَـعَ النَّبِـيِّ صَـلَّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ فِي بَعْـضِ تِلْـكَ الْأَيَّـامِ الَّتِي قَاتَـلَ فِـيهِنَّ رَسُـولُ اللّٰهِ صَـلَّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ غَيْرُ طَلْحَةَ ، وَسَعْدٍ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

**واتــای فەرموودەکە**: لە ئەبوو عـوثمـانەوە، فەرموویەتی { کەس لەگەڵ پێغەمبەر صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نەماوە لە بەشێک لەو ڕۆژانەی پێغەمبەر صَـلَّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ تێیـانـدا جەنگا جگە لە تەڵحە و سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص }

### واتـای وشەکـان

**لَمْ يَبْقَ** : نەماوە

**مَعَ النَّبِيِّ** : لەگەڵ پێغەمبەر صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

**فِي بَعْضِ** : لە بەشێك

**تِلْكَ الْأَيَّامِ** : لەو ڕۆژانەی ( مەبەسـتی ڕۆژی جەنگی ئوحودە )، وشـەی الْأَيَّامِ جەمع و کۆی يَوْم یيە

**قَاتَلَ** : جەنگا، شەڕی کرد پێغەمبەر

**فِيهِنَّ** : تێیاندا، لەو ڕۆژانەدا، وشەی هُنَّ دەگەڕێتەوە بۆ الْأَيَّام

**رَسُولُ اللَّهِ** : نێردراوی اللَّه

**غَيْرُ طَلْحَةَ** : جگە لە تەڵحەی کوڕی عُبَيْدُ اللَّه

**وَسَعْدٍ** : وە سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص

## ۞ چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١ – ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر گەورەیی طەلحەی کوڕی عُبَيْدُ اللَّه

٢ – وە هەروەها بەڵگەیە لەسەر گەورەیی سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص

٣– لەم فەرموودەیە ئازایەتی و قەرەمانی ئەم دوو هاوەڵە بەڕێزەمان بۆ دەردەکەوێت

٤– ناوەڕۆک و حەقیقەتی موسڵمان لە کاتی تەنگانەدا دەردەکەوێ

٥– بەجێنەهێشتنی سەرکردەکان لە کاتی تەنگانەدا

## کورتەیەک لە ژیانی پێشەوا طەلحەی کوڕی عُبَیْدُ اللَّه

ناوی تەواوی بریتییە لە طەلحەی کوڕی عُبَیْدُ اللَّهی کوڕی عوثمانی کوڕی عەمری کوڕی کەعب، کونییەکەی بریتییە لە أَبُو مُحَمَّد، دایکی طەلحە مسوڵمان بووە و هیجرەتیشی کردووە، طەبەرانی گێڕایتییەوە لە ابن عباس کە فەرموویەتی { **أَسْلَمَتْ أُمُّ أبي بَكْرٍ وأَسْلَمَتْ أُمُّ عُثْمانَ وَأَسْلَمَتْ أُمُّ طَلْحَةَ وَأَسْلَمَتْ أُمُّ عَبْدِ الرَّحمن بنِ عَوف** } واتا: دایکی ئەبووبەکر و عوثمان و تەڵحە و عبد الرحمن ی کوڕی عەوف مسوڵمان بوونە، پێشەوا طەلحە لە شەڕی بەدر بەژداری کردووە و یەکێک بووە لەو کەسانەی موژدەی بەهەشتیان پێدراوە، لە شەڕی جەمەل دەکوژرێ لە ساڵی ٣٦ ی کۆچی دا وتراوە مەڕوانی کوڕی حەکەم تیرێکی تێ دەگرێت و لەچۆکی دەدات جا بەردەوام خوێنی پێدا دێتە خوارەوە و نەزیف دەبێت تا ئەوکاتەی دەمرێت لە تەمەنی ٦٠ ساڵی یان ٦٢ ساڵی، چەند وتیەیەک هەیە لەسەر تەمەنەکەی، کۆی گشتی ئەو فەرموودانەی گێڕایتییەوە ٣٨ فەرموودەیە و ٧ فەرموودەیان لە صەحیحەین دا هاتووە

## پێشه‌وا طه‌لحه‌ له‌ فه‌رمووده‌یه‌کی تری صه‌حیح دا

- له‌به‌ر پاراستن و زۆر به‌رگری کردنی له‌ پێغه‌مبه‌ر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ده‌ستی شه‌ل و گۆج ده‌بێت

عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ ، قَالَ { **رَأَيْتُ يَدَ طَلْحَةَ الَّتِي وَقَى بِهَا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ شَلَّتْ** } رواه البخاري و ابن ماجه و أحمد

واتای فه‌رمووده‌که‌: له‌ قه‌یسی کوڕی باوکی حازمه‌وه‌ فه‌رموویه‌تی { ئه‌و ده‌سته‌ی طه‌لحه‌ی کوڕی عُبَيْدُ اللَّه‌م بینی که‌ زۆر به‌رگری له‌ پێغه‌مبه‌ری پێ کردبوو شه‌ل و گۆج ببوو }

- پێشه‌وا عومه‌ر ده‌رباره‌ی ده‌فه‌رموویت

وَقَالَ عُمَرُ { **تُوُفِّيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ عَنْهُ رَاضٍ** } كِتابُ الصحيح البخاري

واتاکه‌ی: پێشه‌وا عومه‌ر فه‌رموویه‌تی { پێغه‌مبه‌ر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وه‌فاتی کرد وه‌ پێغه‌مبه‌ر له‌ طه‌لحه‌ی کوڕی عُبَيْدُ اللَّه‌ ڕازی بوو }

## ١٦. عبد الرحمن ی كوڕی عەوف

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

{أَبُـو بَكْـرٍ فِي الْجَنَّـةِ، وَعُمَـرُ فِي الْجَنَّـةِ، وَعُثْمَـانُ فِي الْجَنَّـةِ، وَعَلِيٌّ فِي الْجَنَّةِ، وَطَلْحَـةُ فِي الْجَنَّةِ، وَالزُّبَيْـرُ فِي الْجَنَّـةِ، وَعَبْـدُ الـرَّحْمَنِ بْـنُ عَـوْفٍ فِي الْجَنَّـةِ، وَسَـعْدٌ فِي الْجَنَّـةِ، وَسَـعِيدٌ فِي الْجَنَّـةِ، وَ أَبُـو عُبَيْـدَةَ بْـنُ الْجَـرَّاحِ فِي الْجَنَّـةِ} رواه الترمـذي واللفظ له وأحمد و أبو داود و ابن ماجه

**واتای فەرموودەكە**: پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ فەرموویەتی {ئەبوو بەكر لە بەهەشـتە، وە عومەر لە بەهەشـتە، وە عوثمان لە بەهەشـتە، وە عەلی لە بەهەشـتە، وە طەلحە لە بەهەشـتە، وە زوبەیر لە بەهەشـتە، وە عبـد الرحمن ی كوڕی عەوف لە بەهەشـتە، وە سەعدی كوڕی ئەبو وەقاص لە بەهەشتە، وە سەعیدی كوڕی زەید لە بەهەشتە، وە أبو عوبەیدەی كوڕی جەڕڕاح لە بەهەشتە}

✍ لە ڕاسـتیـدا ئەم فەرموودەیە جیـاوازی زانـایـانی لەسـەرە كە ئـایە فەرموودەیەكی صـەحیحە یـان لاوازە، یەک لەو زانـایـانەی دەفەرموێـت ضەعیفە أبو حاتم الرازي یە

## واتای وشەکان

**أَبُو بَكْرٍ** : ئەبوو بەکری صدیق، ناوی خۆی عبداللَّه ی کوڕی عوثمانە

**فِي الْجَنَّةِ** : لە بەهەشتە

**طَلْحَةُ** : طەلحەی کوڕی عُبَيْدُ اللَّه

**سَعْدٌ فِي الْجَنَّةِ** : سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص لە بەهەشتە

**سَعِيدٌ فِي الْجَنَّةِ** : سەعیدی کوڕی زەید لە بەهەشتە

### ۞ چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١ – ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر گەورەیی ئەم ١٠ هاوەڵە، وە گەورەییە بۆ پێشەوا عبد الرحمن ی کوڕی عەوف

٢ – مەرج نییە تەنها ئەو ١٠ هاوەڵە موژدەی بەهەشتیان پێدرابێت و تەواو، بەڵکو دایە خەدیجە و بیلال و دایکی ئەنەس و عوکاشە و چەندانی تریش موژدەی بەهەشتیان پێ دراوە

ئەو ١٠ هاوەڵە بەڕێزە پێیان دەوترێت عەشەرەی موبەششەرە، واتا دە موژدە پێدراوەکە بە بەهەشت

١ – ئەبووبەکری صدیق

٢ – عومەری کوڕی خەتاب

٣- عوثمانی کوڕی عەفان

٤- عەلی کوڕی ئەبووتالیب

٥- عبد الرحمن ی کوڕی عەوف

٦- زوبەیری کوڕی عەوام

٧- سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص

٨- أبو عوبەیدەی کوڕی جەرڕاح

٩- طەلحەی کوڕی عُبَیْدُ اللَّه

١٠- سەعیدی کوڕی زەید

ناوی هەر دەیان لەم دوو بەیتە شیعرە دا کۆکراوەتەوە

لَقَدْ بَشَّرَ الهَادي مِنَ الصَّحْبِ زُمْرَةً

بِجَنَّاتِ عَدْنٍ كُلُّهُمْ فَضْلُهُ اشْتَهَرْ

سَعِيدٌ زُبَيْرٌ سَعْدٌ طَلْحَةٌ عامِر

أَبُو بَكْرٍ عُثْمانُ ابْنُ عَوْفٍ عَلِيٌّ و عُمَرْ

مەبەست لە عامِر لە بەیتی دووەم دا أبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاحە، چونکە أبو عوبەیدە ناوی خۆی عامرە

## کورتەیەکـــ لە ژیانـــی پێشەوا عبد الرحمـــن ی کوڕی عەوف

ناوی تەواوی بریتییە لە عبد الرحمن ی کوڕی عەوفی کوڕی عەبدی عەوفی کوڕی عەبدول حاریث، ناوی ڕاستی خۆی عەبدول کەعب یان عەبدو عەمر بووە و پێغەمبەر ناوەکەی گۆڕیوە، دایکی ناوی شیفا بووە، ١٠ ساڵ دوای ساڵی فیل لە دایک بووە، یەکێک بووە لەو دە کەسەی موژدەی بەهەشتیان پێدراوە، هەر لەسەرتای ئیسلامەوە مسوڵمان بووە، پێشەوا زوهری دەڵێت عبد الرحمن ی کوڕی عەوف نیوەی ماڵی خۆی بەخشی و کردیە صەدەقە لەسەردەمی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دا وە چل هەزار دیناریشی بەخشی لە پێناو اللَّه تَعالَى دا، لەساڵی ٣٢ی کۆچی دا وەفاتی کردووە لە تەمەنی ٧٥ ساڵی دا، والله تعالى أعلم

## فەرموودەیەکی تری صەحیح لەسەر فەزڵ و گەورەیی عبد الرحمن ی کوڕی عەوف

- عَبْد الرحمن ی کوڕی عەوف پیاوێکی صاڵحی دونیا نەویستی خۆ بەکەمزان بوو

عَنْ إِبْرَاهِيمَ ابْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ، أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ أُتِيَ بِطَعَامٍ وَكَانَ صَائِمًا، فَقَالَ { قُتِلَ مُصْعَبُ بْنُ عُمَيْرٍ وَهُوَ خَيْرٌ مِنِّي : كُفِّنَ فِي بُرْدَةٍ إِنْ غُطِّيَ رَأْسُهُ بَدَتْ رِجْلَاهُ، وَإِنْ غُطِّيَ رِجْلَاهُ بَدَا رَأْسُهُ. وَقُتِلَ حَمْزَةُ وَهُوَ خَيْرٌ

**مِنِّي، ثُمَّ بُسِطَ لَنَا مِنَ الدُّنْيَا مَا بُسِطَ. أَوْ قَالَ : أُعْطِينَا مِنَ الدُّنْيَا مَا أُعْطِينَا، وَقَدْ خَشِينَا أَنْ تَكُونَ حَسَنَاتُنَا عُجِّلَتْ لَنَا. ثُمَّ جَعَلَ يَبْكِي، حَتَّى تَرَكَ الطَّعَامَ** } رواه البخاري

واتـای فەرموودەکە: لە ئیبراهیمی کوڕی عبد الرحمن ی کوڕی عەوفەوە، بێگومان عبد الرحمن ی کوڕی عەوف خواردنێکی بۆ هێنرا وە عبد الرحمن بەڕۆژووبوو، جا عبد الرحمن فەرمووی{ موصعەبی کوڕی عومەیر کوژرا وە ئەو لەمن باشتربوو، کفن کرا لە عەبایەکدا ئەگەر سەری داپۆشرابا دوو پێیەکەی بەدیارئەکەوتن، ئەگەر دوو پێیەکەی داپۆشرابا سەری بەدەر ئەکەوت، وە حەمزەی کوڕی عبد المطلب کوژرا وە ئەو لەمن باشتر بوو، پاشان دونیا بۆ ئێمە ڕاخرا ئەوەی کە ڕاخرا، یان وتی: پێمان بەخشرا لە دونیا دا ئەوەی پێمان بەخشرا، وە بێگومان ئەترسین ئەوە چاکەکانمان بێت و دەستپێشخەری کرا بێت بۆمان– لەدونیادا و لە قیامەت بێ بەش بین لە ئەجر و پاداشت دا –، پاشان دەستی کردە گریان و وازی لە خواردنەکە هێنا و نەیخوارد }

## ١٧. گەورەیی موصعەبی کوڕی عومەیر

عَنْ خَبَّابِ بْنِ الْأَرَتِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ

{ مُصْعَبُ بْنُ عُمَيْرٍ قُتِلَ يَوْمَ أُحُدٍ، وَلَمْ تَكُنْ لَهُ إِلَّا نَمِرَةٌ، كُنَّا إِذَا غَطَّيْنَا بِهَا رَأْسَهُ خَرَجَتْ رِجْلَاهُ، وَإِذَا غَطَّيْنَا رِجْلَيْهِ خَرَجَ رَأْسُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : غَطُّوا بِهَا رَأْسَهُ، وَاجْعَلُوا عَلَى رِجْلَيْهِ مِنَ الْإِذْخِرِ } رواه البخاري و مسلم والنسائي والترمذي و أحمد وأبو داود واللفظ له

**واتای فەرموودەکە**: لە خەبابی کوڕی ئەرەتتەوە اللَّه تَعالَى لێی ڕازی بێت فەرموویەتی { موصعەبی کوڕی عومەیر کوژرا لە ڕۆژی جەنگی ئوحود، هیچی نەبوو جگە لە بەرگێک نەبێت، ئێمە بەو بەرگە سەریمان دادەپۆشی پێیەکانی بەدیار دەکەوت، وە ئەگەر پێیەکانیمان دادەپۆشی سەری بەدیار دەکەوت، پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: سەری دابپۆشن بەو بەرگە، وە بیگێڕن و دایبنێن لەسەر پێیەکانی لە پوش و پەلاش گیا }

## واتای وشەکان

**مُصْعَبُ بْنُ عُمَيْرٍ** : موصعەبی کوڕی عومەیر

**قُتِلَ** : کوژرا

**يَوْمَ أُحُدٍ** : لە ڕۆژی جەنگی ئوحود

**وَلَمْ تَكُنْ** : نەبوو

**لَهُ** : بۆی، بۆ موصعەبی کوڕی عومەیر نەبوو

**إِلَّا نَمِرَةٌ** : بێجگە لە بەرگێـگ، نَمِرَةً بەرگێکە چەنـد خەت و هێڵێکی سپی و ڕەشی تێدایە

**إِذَا** : ئەگەر

**غَطَّيْنَا** : دامان پۆشیبوایە

**بِهَا** : بەو بەرگە، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ نَمِرَةً

**رَأْسَهُ** : سەری موصعەبی کوڕی عومەیر، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ مُصْعَبُ بْنُ عُمَيْرٍ

خَرَجَتْ رِجْلَاهُ : دوو پێیەکەی دەرئەکەوت، دوو پێیەکەی دەرئەچوو، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ موصعەبی کوڕی عومەیر

**وَإِذَا غَطَّيْنَا** : وە ئەگەر دامان پۆشی بوایە

رِجْلَيْهِ : دوو پێیەکەی، ئەو هـائە دەگەڕێتەوە بۆ موصـــعەبی کوڕی عومەیر

خَرَجَ رَأْسُهُ : دەردەچوو سـەری، سـەری موصـعەبی دیار ئەکەوت، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ موصعەبی کوڕی عومەیر

فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ : جا پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی

غَطُّوا : بشارنەوە، دابپۆشن

بِهَا : بەو بەرگە، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ نَمِرَةً

رَأْسَهُ : سـەری، سـەری موصعەبی کوڕی عومەیر، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ موصعەبی کوڕی عومەیر

وَاجْعَلُوا : وە بیگێڕن ، دایبنێن، وای لێ بکەن

عَلَى رِجْلَيْهِ : لەسەر دوو پێیەکەی موصعەبی کوڕی عومەیر

مِنَ الْإِذْخِرِ : لە پوش و پەلاش و گیـا، الْإِذْخِرَ جۆرە گیـایەکی بۆن خۆشە

##  چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١– ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەســەر گەورەیی و زوهـد و دونیـا نەویســتی موصعەبی کوڕی عومەیر

٢– ئەو فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ کفن کردنی مردوو

٣– کفن پێش دەخرێت بەســەر قەرزدا، چونکە پێغەمبەر فەرمانی کرد بە کفنکردنی بەعەباو بەرگەکەی، پێش ئەوەی بپرسی قەرزی لەسەرە یان نا

٤– کفن دەبێت داپۆشــەری تەواوی لاشــە بێت ئەگەر کرا، ئەگەرنا دەبێت سەری پێش خرێت بەسەر خوارەوەی دا

٥– صەبرو ئارام گرتن لەسەر فەقیری و نەبوونی

# کورتەیەک لە ژیانی پێشەوا موصعەبی کوڕی عومەیر

ناوی تەواوی بریتییە لە موصعەبی کوڕی عومەیری کوڕی هیشامی کوڕی عەبدو مەناف، کونییەکەی بریتییە لە أَبُو عَبد اللَّه، خێزانی موصعەب ناوی حمنةی کچی جەحش بووە بەمەش موصعەب دەبێتە هاوەڵ زاوای رسول اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ چونکە حمنة خوشکی زەینەبی کچی جەحش بووە، لەسەرەتای هاتنی ئیسلامەوە مسوڵمان بووە لەو کاتەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەماڵی ئەرقەم بوو بەڵام ئیسلامەکەی شاردەوە لە ترسی دایکی جا کاتێک عوثمانی کوڕی طەلحە زانی چوو بەدایکی موصعەبی وت پاشان بەستیانەوەو بەندیان کرد تا ئەوکاتەی مسوڵمانەکان کۆچیان کرد بۆ حەبەشە ئەویش ڕایکردوو چوو بۆ حەبەشە، پاشان گەڕانەوە بۆ مەککە و یەکەم کەس بوو کۆچی کرد بۆ شاری مەدینە و چوو فێرە دینیان بکات و قورئانیان فێربکات، هەروەک بەڕائی کوڕی عازیب فەرموویەتی { أَوَّلُ مَنْ قَدِمَ عَلَيْنَا مُصْعَبُ بْنُ عُمَيْرٍ، وَابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ وَكَانَا يُقْرِئَانِ النَّاسَ } رواه البخاري، موصعەبی کوڕی عومەیر لە بنەماڵەیەکی زۆر دەوڵەمەند بوو لەناو نازو نیعمەت دا دەژیا بەڵام هەمووی کردە قوربانی پەیامە پیرۆزەکەی اللَّه، وە فەقیری هەڵبژارد بەسەر خۆشییەکانی دونیادا، موصعەبی کوڕی عومەیر بەژداری کردووە لەشەڕی بەدر، وە بەژداری کردووە لەشەڕی ئوحود هەر لەو شەڕەش دا وەفات دەکات و شەهید دەکرێت

## ١٨. پێشەوا سەعدی کوڕی موعاذ

قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

{ إِهْتَزَّ الْعَرْشُ لِمَوْتِ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

**واتای فەرموودەکە** { عەرشی اللَّه تَعالَى کەوتە جوڵەو لەرزەوە لەبەر مردنی سەعدی کوڕی موعاذ}

### واتای وشەکان

**إِهْتَزَّ** = هەژا ، لەرزی

**الْعَرْشُ** = عەرشی اللَّهُ تَعَالَى

**لِمَوْتِ** = لەبەر مردنی، بەهۆی مردنی

**سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ** = سەعدی کوڕی موعاذ

## ۞ چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١ – ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر گەورەیی پێشەوا سەعدی کوڕی موعاذ

٢ – بڕوابوون بەوەی عەرشی اللَّه لەرزییە بە مردنی سەعدی کوڕی موعاذ جا ئەم لەرزینە لەبەر خۆشی هاتنی ڕوحی سەعدی کوڕی موعاذ بێت یان هەر هۆکارێکی تر بێت

٣– عەرش شوێن و جێگای اللَّه تَعالَی یە، { الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ } [ سورة طه : ٥ ]

## کورتەیەک لە ژیانی پێشەوا سەعدی کوڕی موعاذ

ناوی تەواوی بریتییە لە سەعدی کوڕی موعاذی کوڕی نوعمان، کونیەکەی بریتییە لە أَبُو عَمْرو، مسوڵمان بووە لە مەدینە لەنێوان عەقەبەی یەکەم و دووەم دا لەسەر دەستی موصعەبی کوڕی عومەیر، ئامادەی شەڕی بەدر و ئوحد بووە، لە ڕۆژی خەندەق تیرێکی بەر ئەکەوێت و لەپاشان مانگێک دەژیت و لە ساڵی پێنجەمی کۆچی دا وەفات دەکات، بە وەفات کردنەکەی عەرشی اللَّه تَعالَی دەکەوێتە لەرزەوە

## فەزڵی سەعدی کوڕی موعاذ لەفەرموودەی تری صەحیح دا

➢ عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ:

**{ أُهْدِيَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حُلَّةُ حَرِيرٍ، فَجَعَلَ أَصْحَابُهُ يَلْمِسُونَهَا وَيَعْجَبُونَ مِنْ لِينِهَا، فَقَالَ : أَتَعْجَبُونَ مِنْ لِينِ هَذِهِ ؟ لَمَنَادِيلُ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ فِي الْجَنَّةِ خَيْرٌ مِنْهَا وَأَلْيَنُ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ**

واتای فەرموودەکە: بەڕائی کوڕی عازیب فەرموویەتی { جلێکی لە ئاوریشم بەدیاری هێنرا بۆ پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، جا هاوەڵان دەستیان لێ دەدا و سەرسام ببوون بە نەرمییەکەی، پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی ئایا سەرسامن بە نەرمی ئەو جلە ؟ بێگومان کلێنکس و دەستسری سەعدی کوڕی موعاذ لە بەهەشت دا لەوە باشترە و نەرمترە }

## ١٩. پێشه‌وا بیلالی کوڕی ڕه‌باح

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِبِلَالٍ عِنْدَ صَلَاةِ الْغَدَاةِ { يَا بِلَالُ، حَدِّثْنِي بِأَرْجَى عَمَلٍ عَمِلْتَهُ عِنْدَكَ فِي الْإِسْلَامِ مَنْفَعَةً، فَإِنِّي سَمِعْتُ اللَّيْلَةَ خَشْفَ نَعْلَيْكَ بَيْنَ يَدَيَّ فِي الْجَنَّةِ " قَالَ بِلَالٌ: مَا عَمِلْتُ عَمَلًا فِي الْإِسْلَامِ أَرْجَى عِنْدِي مَنْفَعَةً، مِنْ أَنِّي لَا أَتَطَهَّرُ طُهُورًا تَامًّا فِي سَاعَةٍ مِنْ لَيْلٍ وَلَا نَهَارٍ؛ إِلَّا صَلَّيْتُ بِذَلِكَ الطُّهُورِ مَا كَتَبَ اللَّهُ لِي أَنْ أُصَلِّيَ }

مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

**واتـای فەرموودەکە**: پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بەبیلالی فەرموو لەکاتی نوێژی بەیانی { ئەی بیلال قسەم بۆ بکە بە گەورەترین و ئومێد ترینی کردەوە لەلای خۆت لە ڕووی سوود و پاداشت دا ئەنجامت دابێت لە ئیسلام، بێگومان ئەمشەو گوێم لە خشەشی نەعلەکانت بوو لە پێشم دا لە بەهەشت، بیلال فەرمووی: هیچ کردەوەیەکم نەکردووە لە ئیسلامدا بە ئومێد تر و گەورەتر بێت لەلام لە ڕووی سوود و پاداشت دا، لەوەی بێگومان من لە هیچ کاتێکی شەو

و ڕۆژ دا دەســـتنوێژێکی تەواوم هەڵنەگرتووە ئیللا بەو دەســـتنوێژەی ئەوەندەی اللَّه نوسیویەتی و دایناوە بۆم نوێژم کردووە }

## واتای وشەکان

**عِنْدَ** : لەکاتی

**صَلَاةِ الْغَدَاةِ** : نوێژی بەیانی

**يَا بِلَالُ** : ئەی بیلال

**حَدِّثْنِي** : بۆم باسکە، بگێڕەوە بۆم، قسەم بۆ بکە

**بِأَرْجَى عَمَلٍ** : بە ئومێدترینی کردەوە

**عَمِلْتَهُ** : کردبێتت، ئەنجامت دابێت

**عِنْدَكَ** : لەلای خۆت

**فِي الْإِسْلَامِ** : لە دینی ئیسلام دا

**مَنْفَعَةً** : لە سوود و نەفعدا، لە سوود و پاداشت دا

**فَإِنِّي** : جا بێگومان من

**سَمِعْتُ** : گوێم لێ بوو

**اللَّيْلَةَ** : ئەو شەو

**خَشْــفَ نَعْلَيْـكَ** : خشــه‌ی نه‌عله‌کانـت، ده‌نـگ و جووله‌ی دوو نه‌عله‌که‌ت

**بَيْنَ يَدَيَّ** : له‌به‌ر ده‌مم دا، له‌پێشــم دا، خۆی وشــه‌ی بَيْنَ واتا نێوان، وه وشه‌ی يَدَيَّ واتا دوو ده‌سته‌که‌م

**فِي الْجَنَّةِ** : له به‌هه‌شت

**قَالَ بِلَالٌ** : بیلال وتی

**مَا عَمِلْتُ عَمَلًا** : هیچ کرده‌وه‌یه‌کم نه‌کردووه

**مَا عَمِلْتُ** : نه‌مکردووه

**عَمَلًا** : کرده‌وه‌یه‌ک

**فِي الْإِسْلَامِ** : له ئیسلام دا

**أَرْجَى عِنْدِي** : به ئومێد تر بێت له‌لای من

**مَنْفَعَةً** : له سوود و نه‌فع دا، له‌پاداشت دا

**مِنْ** : له

**أَنِّي** .: بێگومان من

**لَا أَتَطَهَّرُ** : خۆم پاک نه‌کردۆته‌وه، ده‌ستنوێژم هه‌ڵنه‌گرتووه

**طُهُورًا تَامًّا** : به ده‌شتنوێژێکی ته‌واو، به پاکییه‌کی ته‌واو

فِي سَاعَةَ : لە کاتێک

مِنْ لَيْلٍ : لە شەو

نَهَارٍ : ڕۆژ

إِلَّا صَلَّيْتُ : ئیللا نوێژم کردووە

بِذَلِكَ الطُّهُورِ : بەو دەستنوێژە، بەو خۆ پاککردنەوەیە

مَا كُتِبَ : ئەوەی نووسیویەتی، ئەوەی تەقدیری کردووە

اللَّهُ : اللّه تَعالَى

لِي : بۆم

أَنْ أُصَلِّيَ : لە نوێژ کردنم

## ۞ چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١– ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر گەورەیی پێشەوا بیلالی بانگدەر

٢– فەزڵ و گەورەیی دەست نوێژ هەڵگرتن و نوێژ کردن لەدوای دەستنوێژەکەوە

٣– گەورەیی نوێژ لە دوای تەوحیدەوە دێت

٤– بەردەوام بوون لەسەر دەست نوێژ هەڵگرتن و پەیوەست بوون پێیەوە

٥- پرسیار کردن لە کردەوەی پیاو چاکان تاوەکوو ئیقتیدایان پێوە بکرێت

٦- پرســیار کردنی مامۆســتا لە کردەوەی قوتابیکەی تا زیاتر هاندی بدات ئەگەر کردەوەکە چاک بوو

٧- دروستییەتی نوێژی سوننەتی دەست نوێژ لەکاتە قەدەغەکراوەکان

## کورتەیەکــــ لە ژیانـــ پێشەوا بیلالـــ حەبەشیـــ

ناوی بیلالی کوڕی ڕەباحی حەبەشییە، دایکی ناوی حەمامە بووە، بانگدەرەکەی ســـەردەمی پێغەمبەر بوو، کۆیلەی ئومەیەی کوڕی خەلەف بووە و زۆریـان ئەزیەت دەدا لەســـەر تەوحید و دینی ئیســـلام پاشـــان ئەبو بەکری صـــدیق دەیکڕێت و ئازادی دەکات، پێشـــەوا عومەری کوڕی خەتاب دەربارەی بیلال دەفەرمووێت { **أَبُو بَكْرٍ سَـــيِّدُنَا. وَأَعْتَقَ سَـــيِّدَنَا، يَعْنِي : بِلَالًا** } رواه البخاري، واتا: ئەبو بەکری صـــدیق گەورەی ئێمەیە وە گەورەی ئێمەشــی ئازاد کردووە، واتـا بیلالی ئـازاد کردووە، لەدوای وەفـاتی پێغەمبەر صَـــلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـــلَّمَ دەچێتە شـــام و لەوێ جیهاد دەکات تا وەفات دەکات لەســـەردەمی پێشـــەوا عومەری کوڕی خەتاب لە ساڵی ٢٠ی کۆچی لەتەمەنی ٦٣ ساڵی دا

## ٢٠. گەورەیی عَبْدُ اللّه ی کوڕی سەلام

عَـنْ سَـعْدِ ابْـنِ أَبِـي وَقَّـاصٍ قَـالَ { مَـا سَـمِعْتُ النَّبِـيَّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ يَقُـولُ لِأَحَـدٍ يَمْشِـي عَلَـى الْأَرْضِ إِنَّـهُ مِـنْ أَهْـلِ الْجَنَّةِ إِلَّا لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلَامٍ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

**واتای فەرموودەکە**:لە سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصەوە فەرموویەتی { نەمبیســتووە لە نێردراوی اللّه بفەرمووێتە هیچ کەســێک کە بڕوات بەسـەر زەوی دا ئەو کەسـە بێگومان ئەهلی بەهەشـتە جگە لە عَبْدُ اللّهِ کوڕی سەلام }

### واتای وشەکان

**مَا سَمِعْتُ** : نەمبیستووە، گوێم لێ نەبووە

**رَسُولَ اللّهِ** : لە نێردراوی اللّه، لە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

**يَقُولُ** : بفەرمووێ، بڵێ

**لِأَحَدٍ** : بۆ کەسێک، دەربارەی کەسێک

**يَمْشِي** : بڕوات

**إِنَّهُ** : بێگومان ئەو کەسە

**مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ** : له ئه‌هلی به‌هه‌شته

**إِلّا** : جگه‌، بێجگه

**لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلَامٍ** : له عبداللَّه ی کوڕی سه‌لام

## ۞ چه‌ند سوودێک له‌م فه‌رمووده‌یه‌دا

١ – ئه‌م فه‌رمووده‌یه به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر گه‌وره‌یی پێشه‌وا عبداللَّه ی کوڕی سه‌لام

٢ – جگه له عبداللَّه ی کوڕی سه‌لام و عه‌شه‌ره‌ی موبه‌شه‌ره چه‌ندین که‌سی تریش موژده‌ی به‌هه‌شتیان پێدراوه‌، به‌ڵام ڕه‌نگه سه‌عدی کوڕی ئه‌بو وه‌قاص نه‌یبیستبێت

## کورته‌یه‌ک له ژیانی عَبْدُ اللَّه ی کوڕی سه‌لام

ناوی عَبْدُ اللَّه ی کوڕی سه‌لامی کوڕی حاریثه‌، له‌نه‌وه‌ی قه‌ینوقاعه‌، له سه‌رده‌می جاهیلیه‌ت دا ناوی الحصین بوو پێغه‌مبه‌ر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ناوی کرده عَبْدُ اللَّه‌، هه‌ر له‌سه‌ره‌تای هاتنی پێغه‌مبه‌ر بۆ مه‌دینه مسوڵمان بووه‌، له ساڵی ٤٣ ی کۆچی وه‌فاتی کردووه له خیلافه‌تی پێشه‌وا موعاویه‌، قورطوبی ده‌ڵێت ٢٥ فه‌رمووده‌ی گێڕاوه‌ته‌وه له پێغه‌مبه‌ر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دوو فه‌رمووده‌یان له صه‌حیحه‌ین دایه

## ٢١. گەورەیی ئوبەی کوڕی کەعب

عَـنْ أَنَـسِ بْـنِ مَالِـكٍ رَضِـيَ اللَّهُ عَنْـهُ، قَـالَ رَسُـولُ اللَّهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ لِأُبَـيٍّ { إِنَّ اللَّهَ أَمَرَنِـي أَنْ أَقْـرَأَ عَلَيْـكَ ( لَـمْ يَكُـنِ الَّـذِينَ كَفَـرُوا مِـنْ أَهْـلِ الْكِتَـابِ ) قَـالَ : وَسَـمَّانِي ؟ قَـالَ : نَعَـمْ " فَبَكَى } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

**واتای فەرموودەکە**: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە اللَّه لێی ڕازی بێت، پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ بە ئوبەی کوڕی کەعبی فەرموو { بەڕاستی اللَّه تَعالَى فەرمانی پێکردوومە ( لَمْ يَكُنِ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ ) بخوێنمەوە بەسەرتا، ئوبەی کوڕی کەعب فەرمووی ئایا اللَّه ناوی هێنام ؟ پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ فەرمووی بەڵێ، جا ئوبەی دەستی کردە گریان – گریا لەخۆشی ئەوەی اللَّه ناوی هێناوە – }

### واتای وشەکان

**قَالَ رَسُولُ اللَّهِ** : نێردراوی اللَّه فەرمووی

**لِأُبَيِّ** : بە ئوبەی کوڕی کەعب

**إِنَّ اللَّهَ** : بەڕاستی اللَّه تَعالَى

**أَمَرَنِي** : فەرمانی پێ کردم

**أَنْ أَقْرَأَ** : بخوێنمەوە

**عَلَيْكَ** : لەسەر تۆ

**لَمْ يَكُنِ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ** : ئایەتی یەکەمی سورەتی ( البينة ) یە

**قَالَ** : ئوبەی کوڕی کەعب فەرمووی

**وَسَمَّانِي** ؟ ئایا ناوی هێنام ( ئایا بە ناو ناوی خۆمی هێنا؟ )

**قَالَ** : پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی

**نَعَمْ** : بەڵێ

**فَبَكَى** : جا گریا، دەستی کردە گریان (ئوبەی کوڕی کەعب)

## ۞ چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١– ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر فەزڵ و گەورەیی ئوبەی کوڕی کەعب

٢– شانازی و گەورەیی و ڕێزە بۆ بەندەیەك خالقی ئەرز و ئاسمانەکان ناوی بهێنێت

٣– دڵخۆشبوونی ئوبەی کوڕی کەعب بەوەی اللَّه تَعالَى ناوی هێناوە

٤– زۆر جار مرۆڤ لەبەر زۆر دڵخۆش بوون دەست دەکات بە گریان

# کورتەیەک لە ژیانی پێشەوا ئوبەی کوڕی کەعب

ناوی ئوبەی کوڕی کەعب ی کوڕی قەیس ی کوڕی عوبەیدە، کونییەکەی بریتییە لە أَبُو الْمُنْذِر، گەورەی قورئان خوێنەرەکانە، وتراوە یەکەم کەس بووە نوسینی بۆ پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کردووە، چەندین صەحابەی گەورە ڕیوایەتیان لێ کردووە لەوانە عومەری کوڕی خەتاب و عوبادەی کوڕی صامت و سەهلی کوڕی سەعد و ئەبو موسای ئەشعەری و ئیبن عەبباس و ئەبوو هورەیرە و ئەنەس و چەندانی تر، قورطوبی دەڵێت ئوبەی کوڕی کەعب ١٦٤ فەرموودەی گێڕاوەتەوە لە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ١٣ فەرموودەیان لە صەحیحەین دا هاتووە، جیاوازی هەیە دەربارەی کاتی وەفات کردنەکەی ئایا لەسەردەمی خەلافەتی عومەر وەفاتی کردووە یان لە خەلافەتی عوثمان وە ئایا لەساڵی چەندی کۆچی وەفاتی کردووە چەندین وتە هەیە دەربارەی، بۆیە اللَّه تَعالَى زاناترە بە کاتی وەفات کردنەکەی

## ٢٢. پێشه‌وا ئه‌بوو هوره‌یره

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ

{ قُلْــتُ : يَــا رَسُــولَ اللَّهِ، ادْعُ اللَّهَ أَنْ يُحَبِّبَنِــي أَنَــا وَأُمِّــي إِلَــى عِبَــادِهِ الْمُــؤْمِنِينَ، وَيُحَبِّــبَهُمْ إِلَيْنَــا. قَــالَ، فَقَــالَ رَسُــولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ اللَّهُـمّ حَبِّـبْ عُبَيْـدَكَ هَـذَا – يَعْنِي أَبَـا هُرَيْـرَةَ - وَأُمَّـهُ إِلَى عِبَـادِكَ الْمُـؤْمِنِينَ، وَحَبِّـبْ إِلَـيْهِمُ الْمُـؤْمِنِينَ }

رواه مسلم

**واتـای فه‌رمووده‌كه**: له ئه‌بوو هوره‌یره‌وه اللَّه تَعالَی لێی ڕازی بێت فه‌رموویه‌تی { وتم : ئه‌ی نێردراوی اللَّه داوا له اللَّه بكه من و دایكم خۆشه‌ویست بكات له‌لای به‌نده بڕواداره‌كانی، وه به‌نده بڕواداره‌كانی خۆشه‌ویست بكات له‌لای ئێمه، ئه‌بوو هوره‌یره فه‌رمووی، جا پێغه‌مبه‌ر صَلَّی اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فه‌رمووی: ئه‌ی اللَّه تَعالَی ئه‌و به‌ندۆكه‌ت خۆشه‌ویست بكه‌ی — واتا ئه‌بوو هوره‌یره — وه دایكی ئه‌بوو هوره‌یره‌ش خۆشه‌ویست بكه‌ی له‌لای به‌نده بڕواداره‌كانت، وه بڕوادارانیش خۆشه‌ویست بكه‌ی له‌لایان – له‌لای ئه‌بوو هوره‌یره و دایكی – }

## واتای وشەکان

**قُلْتُ** : وتم

**يَا رَسُولَ اللَّهِ** : ئەی نێردراوی اللَّه

**ادْعُ اللَّهَ** : داوا لە اللَّه بکە، بپاڕێوە لە اللَّه

**أَنْ يُحَبِّبَنِي أَنَا وَأُمِّي** : من و دایکم خۆشەویست بکات

**إِلَى عِبَادِهِ الْمُؤْمِنِينَ** : لەلای بەندە بڕوادارەکانی

**وَيُحَبِّبَهُمْ** : وە ئەوان خۆشەویست بکەی، بڕواداران خۆشەویست بکەی، وشەی هُمْ دەگەڕێتەوە بۆ الْمُؤْمِنِينَ

**إِلَيْنَا** : لەلای ئێمە، لای من و دایکم

**قَالَ** : فەرمووی ئەبوو هورەیرە

**فَقَالَ** : جا فەرمووی پێغەمبەر

**اللَّهُمَّ** : ئەی اللَّه تَعالَى

**حَبِّبْ** : خۆشەویستکەی

**عُبَيْدَكَ هَذَا** : ئەو بەندۆکەت

**يَعْنِي أَبَا هُرَيْرَةَ** : واتا ئەبوو هورەیرە

**وَأُمَّهُ** : وە دایکی ئەبوو هورەیرە، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ أَبَا هُرَيْرَةَ

**إِلَى** : لای

**عِبَادِكَ الْمُؤْمِنِينَ** : بەندە بڕوادارەکانت

**عِبَادِكَ** : وشـــەی عِبَاد جەمع و کۆی عَبْد ییە، عَبْد واتا بەندە، عَبْد زیـاد لە ٢٠ جەمـع و کـۆی هەیە، ئەمەش هەنـدێـک لە جەمـع و کۆیەکانییەتی ١- عَبْدُون، ٢– عَبِيدٌ، ٣– أَعْبُدٌ، ٤– عِبادٌ، ٥– عُبْدانٌ، ٦– عِبْدانٌ، ٧– عِبِدَّانٌ، ٨– مَعْبَدَةٌ، ٩– مَعَابِد ١٠– عِبِدَّاء، ١١– عِبِدَّا، ١٢– عُبُدٌ، ١٣– عَبُدٌ، ١٤– مَعْبُداء، ١٥– عَبِيدُون

**وَحَبِّبْ** : وە خۆشەویستکەی

**إِلَيْهِم** : لەلایان، لەلای ئەبوو هورەیرە و دایکی

**الْمُؤْمِنِينَ** : بڕواداران، ئیمـانـداران، مُؤْمِنِينَ و مُؤْمِنُون جەمع و کۆی مُؤْمِن ییە، مُؤْمِن واتا بڕوادار

## ۞ چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١– ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر فەزڵ و گەورەیی ئەبوو هورەیرە

٢– لەم فەرموودەیەدا گەورەیی دایکی ئەبوو هورەیرەشی تێدایە

٣– قەبووڵبوونی دوعاکەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، هەر مسوڵمانێک گوێی لەناوی ئەبوو هورەیرە بێت خۆشی ویستووە

# کورتەیەک لە ژیانی پێشەوا ئەبوو هورەیرە

لەناوی ئەبوو هورەیرە دا جیاوازییەکی زۆر هەیە بەڵام ناوی مەشهوری بریتییە لە عَبْدُ الرَّحْمٰن ی کوڕی صەخر ، ئەبوو هورەیرە دەفەرموێت لە سەردەمی نەفامیدا ناوم عَبْدُ الشَّمس بووە بەڵام کە ئیسلام هات ناوم نرا عَبْدُ الرَّحْمٰن، دایکی ناوی مەیمونەیە یان ئومەیمە، ئافرەتێکی مسوڵمان بووە، پرسیار لە ئەبوو هورەیرە کرا بۆ ناونراوی باوکی پشیلە ئەویش فەرمووی ڕۆژێک بەڕێگایەک دا ڕۆیشتم و پشیلەیەکم بینی و هەڵم گرت خەڵکی ناویان نام ئەبوو هورەیرە باوکی پشیلە، لە پێش هیجرەت کردنی بۆ لای پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بە چەند ساڵێک زووتر مسوڵمان بووە لەسەر دەستی طوفەیلی کوڕی عەمر، لەساڵی شەشی کۆچی دا هیجرەت دەکات بۆ شاری مەدینە، پێشەوا بوخاری دەفەرمووێت ٨٠٠ کەسی خاوەن علم و زانست فەرموودەیان لێ گێڕاوەتەوە لەوانە ابن عمر و ابن عباس و جابر و أنس و سعید بن المسیب و عروة ابن الزبیر و عطاء ابن أبي رباح و زۆری تریش، لەهەموو هاوەڵانی تر زیاتر فەرموودەی لەبەرکردووە وە لە هەمووشیان زیاتر فەرموودەی گێڕاوەتەوە لە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەویش ٥٣٧٤ فەرموودەیە، ٦٠٩ فەرموودەیان لە صەحیحەین دا هاتووە ، ناوی ئەو هاوەڵانەی زۆرترین فەرموودەیان گێڕاوەتەوە

قَالَ الجَمَالُ بْنُ ظَهِيرة

سَبْعٌ مِنَ الصَّحْبِ فَوْقَ الأَلْفِ قَدْ نَقَلُوا
مِنَ الحَدِيثِ عَنِ المُخْتَارِ خَيْرِ مُضَرْ

أَبُو هُرَيْرَةَ سَعْدٌ جَابِرٌ أَنَسْ
صِدِّيقَةٌ وَابْنُ عَبَّاسٍ كَذا ابْنُ عُمَرْ

واتـاکەی: ئەو هـاوەڵانەی زیـاد لە هەزار فەرمـوودەیـان لە پـێـغەمـبەرەوە گواســتۆتەوە، ئەبوو هورەیرە و ئەبوو ســەعیدی خودری و جابر و ئەنەس و عائیشــە و عبداللَّە ی کوڕی عەبباس و عبداللَّەی کوڕی عومەرن، رَضِـيَ اللَّهُ عَنْهُم

ئەوانەی زۆرتـریـن فەرمـوودەیـان گـێڕاوەتەوە بەم شــێـوەیەی خـوارەوەیە بەڕیزبەندی

١– ئەبوو هورەیرە: ٥٣٧٤ فەرمووده

٢– عَبْد اللَّەی کوڕی عومەر: ٢٦٣٠ فەرمووده

٣– ئەنەسی کوڕی مالیک: ٢٢٨٦ فەرمووده

٤– دایه عائیشه: ٢٢١٠ فەرمووده

٥– عَبْد اللّٰەی کوڕی عەبباس: ١٦٦٠ فەرمووده

٦– جابر: ١٥٤٠ فەرمووده

٧– ئەبوو سەعیدی خودری: ١١٧٠ فەرمووده

ئەم سێ بەیتەش بەڕیزبەندی دانراوه بۆ ئەو حەوت هاوەڵەی که زۆرترین فەرموودەیان گێڕاوەتەوه

المُكْثِرُونَ فِي رِوايَةِ الخَبَرْ

مِنَ الصَّحَابَةِ الأَكارِمِ الغُرَرْ

أَبُو هُرَيْرَةَ يَلِيهِ ابْنُ عُمَرْ

فَأَنَسٌ فَزَوْجَةُ الهادِي الأَبَرْ

ثُمَّ ابْنُ عَبَّاسٍ يَليهِ جَابِرُ

وَبَعْدَهُ الخُدْرِيُّ فَهْوَ الآخِرُ

له ساڵی ٥٩ ی کۆچی دا وەفاتی کردووه له شاری مەدینه دا له تەمەنی ٧٨ ساڵی دا

## ٢٣. پێشەوا عَبْدُاللَّه ی کوڕی عومەر

عَـنِ ابْـنِ عُمَـرَ ، عَـنْ أُخْتِـهِ حَفْصَـةَ ، أَنَّ النَّبِـيَّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَهَا { إِنَّ عَبْدَ اللَّهِ رَجُلٌ صَالِحٌ } مُتَّفَقٌ عَليه

**واتای فەرموودەکە**: لە عَبْدُ اللَّه ی کوڕی عومەرەوە لە حەفصەی خوشکی عَبْدُ اللَّه وە، بێگومان پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی بە حەفصە { بەڕاستی عَبْدُ اللَّه پیاوێکی صاڵح و چاکە }

### واتای وشەکان

**ابْنِ عُمَرَ** : کوڕی عومەر، عَبْدُ اللَّه ی کوڕی عومەر

**أُخْتِهِ** : خوشکی عَبْدُ اللَّه ی کوڕی عومەر ، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ عَبْدُ اللَّه

**حَفْصَةَ** : حەفصە ( خێزانی پێغەمبەرە و کچی عومەری کوڕی خەتابە و خوشکی عَبْد اللَّه یە )

**أَنَّ النَّبِيَّ** : بێگومان پێغەمبەر

**قَالَ** : فەرمووی

**لَهَا** : پێی، بە حەفصەی، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ حَفْصَةَ

**إِنَّ عَبْدَ اللَّهِ** : بێگومان عَبْدُ اللَّه

**رَجُلٌ** : پیاوێکی

**صَالِحٌ** : صاڵحە، چاکە

## ۞ چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١– ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر گەورەیی پێشەوا عبداللَّه ی کوڕی عومەر

٢– مەرج نییە هەموو خەونێک لێک بدرێتەوە ( پێغەمبەر بۆیە ئەو فەرموودەی فەرموو چونکە عبداللَّه ی کوڕی عومەر خەونێکی بینی بوو )

٣– ئەدەب و ڕەوشتی عبداللَّهی کوڕی عومەر کە ڕاستەوخۆ بەخۆی خەونەکەی بە پێغەمبەر نەوت بەڵکو بە حەفصەی خوشکی فەرموو بە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بڵێت

٤– دروستە مەدحی کەسێک بکەی بە مەرجێک کە ترسی ئەوەت لێ نەبێت لە خۆی بایی بێت و مغرور بێت

## کورتەیەک لە ژیانی پێشەوا عَبْدُ اللَّه ی کوڕی عومەر

ناوی تەواوی بریتییە لە عبداللە ی کوڕی عومەری کوڕی خەتابی کوڕی نوفەیل، کونییەکەی بریتییە لە أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَٰن، سێ ساڵ لە دوای هاتنی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە دایک بووە، لەگەڵ باوکی دا دەبێتە مسوڵمان و پاشان هیجرەت دەکەن بۆ مەدینە، لە شەڕی بەدر و ئوحد دا داوای لە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کرد ئامادەی جەنگ بێت بەڵام ڕێی پێنەدرا لەبەر تەمەن بچووکی لەپاشان لەشەڕی خەندەق ڕێی پێ درا ئامادەی جەنگ بێت و ئەو کات تەمەنی پازدە ساڵ بوو، یەک لەو هاوەڵانە بووە کە زۆرترین فەرموودەی لە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ گێڕاوەتەوە، ژمارەی فەرموودەکانیش ٢٦٣٠ فەرموودەیە، ١٨٠ فەرموودەیان لە صەحیحەین دا هاتووە، لە تەمەنی ٨٧ ساڵی دا وەفاتی کردووە، اللَّه تَعالَى لەخۆیی و باوکی ڕازی بێت

## ٢٤. گەورەیی عَبْدُ اللّەی کوڕی عەبباس

عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ { أَنَّ النَّبِـيَّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ دَخَـلَ الْخَـلَاءَ فَوَضَـعْتُ لَـهُ وَضُـوءًا، قَـالَ : مَـنْ وَضَـعَ هَـذَا ؟ فَأُخْبِرَ، فَقَالَ : اللَّهُمَّ فَقِّهْهُ فِي الدِّينِ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

**واتای فەرموودەکە**: لە ئیبن عەبباسـەوە { بێگومان پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ چووە ئاودەسـت جا منیش ئاوی دەسـت نوێژم بۆ داناو ئامادەکرد، پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ فەرمووی کێ ئەو ئاوەی ئامادە کردووە ؟ جا هەواڵی پێدرا – کە ئیبن عەبباس ئامادەی کردووە – جا پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی ئەی اللّه ئیبن عەبباس شارەزا بکە لە دین }

### واتای وشەکان

**أَنَّ النَّبِيَّ** : بێگومان پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

**دَخَلَ** : چووە ناو ، داخیل بوو

**الْخَلَاءَ** : ئاو دەسـت، خۆی الخَلَاء واتا شـوێنێکی چۆل، خەڵکیش بۆ دەست بەئاو گەیاندن ئەچنە شوێنی چۆل

**فَوَضَعْتُ** : جا دامنا، ئاماده‌م کرد

**لَهُ** : بۆ پێغه‌مبه‌ر، ئه‌و هائه ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ النَّبي

**وَضُـوءًا** : ئاوی ده‌ســـت نوێژ، وَضُـوء ئاوی ده‌ســـتنوێژه به فه‌تحه‌ی واوه‌که، وُضُوء کرداری ده‌ستنوێژه‌که‌یه به ضه‌مه‌ی واوه‌که

**قَال** : فه‌رمووی ( پێغه‌مبه‌ر )

**منْ وَضَعَ هَذَا ؟** : کێ ئه‌وه‌ی داناوه، چ که‌سێک ئه‌و ئاوه‌ی داناوه ؟

فَأُخْبِرَ : جا هه‌واڵی پێدرا، پێی ڕاگه‌یه‌ندرا ( که ئیبن عه‌بباس ئاماده‌ی کردووه )

**فَقَالَ** : جا فه‌رمووی ( پێغه‌مبه‌ر )

**اللَّهُمَّ** : ئه‌ی اللَّه تَعالَی

**فَقِّهْهُ** : شاره‌زای بکه، تێی بگه‌یه‌نه، ئه‌و هائه بۆ ابْنِ عَبَّاسٍ ده‌گه‌ڕێته‌وه

**فِي الدِّينِ** : له دین، له قورئان

## ۞ چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١– ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر فەزڵ و گەورەیی ئیبن عەبباس

٢– دوعای پێغەمبەر قەبووڵە و وەرگیراوە، وە ئیبن عەبباس زاناترین کەس بووە بە تەفسیری قورئان

٣– گەورەیی علم و زانست و هاندانی خەڵکی بۆ بە دەستهێنانی

٤– خزمەت کردنی گەورەکان، وەک ئیبن عەبباس چۆن خزمەتی پێغەمبەری کرد

٥– دوعاکردن بۆ ئەو کەسەی چاکەت لەگەڵ ئەکات

## کورتەیەک لە ژیانی پێشەوا عبداللَّه ی کوڕی عەبباس

ناوی تەواوی بریتییە لە عبداللَّەی کوڕی عەبباسی کوڕی عبد المطلب ی کوڕی هاشـم، کونییەکەی بریتییە لە أَبُو العَبَّاس، کوڕە مامی پێغەمبەرە صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ٣ سـاڵ پێش کۆچکردنی مسـوڵمانان بۆ مەدینە لە دایک بووە، لەو کاتەی پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ وەفات دەکات تەمەنی ١٣ سـاڵ بووە، أبو بکرة فەرموویەتی عبداللَّه ی عەبباس هاتە لامان لە بەصـرە لەناو عەرەب دا وێنەی نەبوو لە جسـم و علم و جل و بەرگ و جوانی و تەواوی، نازناو و لەقەبی بریتییە لە حِبْر و بَحْر علم و زانسـتەکەی وەك بەحر و دەریا فراوان و زۆربووە، لە سـاڵی ٦٨ی کۆچی دا وەفاتی کردووە لە شـاری طائیف لە تەمەنی ٧١ سـاڵی دا، لەو کاتەی وەفاتی کرد إبن الحنفیة فەرمووی { اليَوْم مَاتَ رَبَّانِيُّ هَذهِ الأُمَّةِ } واتا: ئەمڕۆ پەروەردەکەری ئەم ئوممەتە وەفاتی کرد، پێشەوا مەسروق فەرموویەتی: لەو کاتەی عبداللَّه ی کوڕی عەبباسم بینی وتم جوانترین کەسە، لەو کاتەی قسەی کرد وتم ڕەوانبێژترین کەسە، ئەو کاتەی حەدیثی گێڕاوە وتم زاناترین کەسـە، وە ناوی لێنرابوو البَحْر لەبەر زانسـتە زۆرەکەی، عبـداللَّه ی کوڕی عەببـاس یەکێـک بووە لەو حەوت هـاوەڵەی کە زۆرترین فەرموودەیان گێڕاوەتەوە لە پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ ئەویش ١٦٦٠ فەرموودەیە، ٢٣٤ فەرموودەیان لە صەحیحەین دا هاتووە

## ٢٥. پێشەوا عَبْد اللّەی کوڕی مەسعوود

عَـنْ أَبِـي مُوسَـى رَضِـيَ اللَّهُ عَنْـهُ قَـالَ { قَـدِمْتُ أَنَـا وَأَخِـي مِـنَ الْـيَمَنِ، فَمَكَثْنَـا حِينًـا مَـا نُـرَى ابْـنَ مَسْـعُودٍ وَأُمَّـهُ إِلَّا مِـنْ أَهْـلِ الْبَيْتِ، مِنْ كَثْرَةِ دُخُولِهِمْ، وَلُزُومِهِمْ لَهُ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

**واتای فەرموودەکە**: لە ئەبو موسـای ئەشـعەرییەوە فەرموویەتی { من و برام هاتین لە یەمەنەوە، جا سـەردەمێک ماینەوە، وا گومانمان برد عبد اللّەی کوڕی مەسـعوود و دایکی ئیللا یەکێک بن لە بنەماڵەی پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ، لەبەر زۆر چونیان و پەیوەسـت بوونیان بە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ }

### واتای وشەکان

**قَدِمْتُ أَنَا وَأَخِي** : من و برام هاتین

**مِنَ الْيَمَنِ** : لە وڵاتی یەمەنەوە

**فَمَكَثْنَا** : جا ماینەوە

**حِينًا** : زەمانێک، سەردەمێك، کاتێک لە زەمان

**مَا نُرَى** : ئەوەی دەمان دیت، ئەوەی گومانمان دەبرد

**ابْنَ مَسْعُودٍ** : کوڕی مەسعوود، عبداللَّه ی کوڕی مەسعوود

**وَأُمَّهُ** : وە دایکی، دایکی عبداللَّه، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ ابْنَ مَسْعُودٍ

**إِلَّا مِنْ أَهْلِ الْبَيْتِ** : ئیللا لە بنەماڵەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بن

**مِنْ كَثْرَةِ** : لە زۆری

**دُخُولِهِمْ** : چونیان، داخیل بوونیان

**وَلُزُومِهِمْ** : وە پەیوەست بوونیان

**لَهُ** : بۆی، بۆ پێغەمبەر

## ۞ چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١– ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر گەورەیی عبداللَّهی کوڕی مەسعوود و دایکی

٢– تایبەتمەندی عبد اللَّهی کوڕی مەسعوود بە پەیوەستبوونی بە پێغەمبەرەوە

## کورتەیەک لە ژیانی پێشەوا عبداللَّه ی کوڕی مەسعوود

ناوی تەواوی بریتییە لە عبداللَّهی کوڕی مەسعوودی کوڕی غافلی کوڕی حەبیبی کوڕی شەمخی کوڕی فاڕی کوڕی مەخزوم، کونییەکەی بریتییە لە أَبُو عبدِ الرَّحْمن، عبداللَّهی کوڕی مەسعوود هەر لە سەرەتاوە مسوڵمان بووە و دوو جار هیجرەتی کردووە بۆ حەبەشە و پاشان لە مەککەوە چوویتە مەدینە و ئامادەی شەڕی بەدریش بووە، یەکەم کەس بووە قورئانی بە ئاشکرا خوێندۆتەوە لە ناو موشریکانی مەککە و پاشان ئەزیەتێکی زۆری درا لەلایەن موشریکەکانەوە، یەکێک بووە لە زاناترینی هاوەڵان هەروەکوو بەخۆی فەرموویەتی { **وَاللَّهِ، لَقَدْ أَخَذْتُ مِنْ فِي رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِضْعًا وَسَبْعِينَ سُورَةً، وَاللَّهِ لَقَدْ عَلِمَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنِّي مِنْ أَعْلَمِهِمْ بِكِتَابِ اللَّهِ** } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واتاکەی { سوێند بە اللَّه وەرمگرتووە لە دەمی پێغەمبەرەوە حەفتا و ئەوندە سوڕەتە، سوێند بە اللَّه هاوەڵانی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەزانن کە ئەمن زاناترینیانم بە کتابە پیرۆزەکەی اللَّه }، عبداللَّه لە ساڵی ٣٢ی کۆچی لە شاری مەدینەدا وەفاتی کردووە و تەمەنی لە ٦٠ ساڵ زیاتر بوو، لە گۆڕستانی بەقیع نێژراوە و هاوەڵان نوێژیان لەسەر کردووە

## ٢٦. پێشەوا موعاذی کوڕی جەبەل

عَـنْ مُعَـاذِ بْـنِ جَبَـلٍ ، أَنَّ رَسُـولَ اللَّهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ أَخَـذَ بِيَـدِهِ وَقَـالَ { يَـا مُعَـاذُ، وَاللَّهِ إِنِّـي لَأُحِبُّـكَ، وَاللَّهِ إِنِّـي لَأُحِبُّـكَ " فَقَـالَ : أُوصِيكَ يَـا مُعَـاذُ، لَا تَـدَعَنَّ فِي دُبُـرِ كُـلِّ صَلَاةٍ تَقُـولُ : اللَّهُـمَّ أَعِنِّي عَلَى ذِكْـرِكَ وَشُـكْرِكَ وَحُسْـنِ عِبَادَتِـكَ } رواه أبـو داود و أحمد و النسائي وهو حديث حسن

**واتـای فەرموودەکە**: لە مـوعـاذی کـوڕی جەبەلەوە، بـێگـومـان پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەستی موعاذی گرت و فەرمووی { ئەی موعاذ سـوێند بە اللّٰه بەڕاسـتی خۆشـم دەوێی، سـوێند بە اللّٰه بەڕاسـتی خۆشـم دەوێی، جا پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ فەرمووی: ئەی موعاذ وەصـیەت و ئامۆژگاریت دەکەم، واز مەهێنە لەدواوەی هەموو نوێژێکەوە دەڵێی: ئەی اللّٰه یارمەتیم بدە لەسـەر زیکر ویاد کردنت وە لەسەر شوکر کردنت وە لەسەر جوانی عیبادەت بۆ کردنت }

## واتای وشەکان

أَخَذَ بِيَدِهِ : دەستی موعاذی گرت

وَقَالَ يَا مُعَاذُ : وە فەرمووی ئەی موعاذ

وَاللَّهِ : سوێند بە اللَّه

إِنِّي : بێگومان من

أُحِبُّكَ : خۆشم دەوێی، تۆم خۆش دەوێت

وَاللَّهِ إِنِّي لَأُحِبُّكَ : سوێند بە اللَّه بێگومان خۆشم دەوێی

فَقَالَ : جا پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی

أُوصِيكَ : وەسیەتت دەکەم، ئامۆژگاریت دەکەم

يَا مُعَاذُ : ئەی موعاذ

لَا تَدَعَنَّ : واز مەهێنە، تەرکی مەکە

فِي دُبُرِ : لەدواوەی

كُلِّ صَلَاةٍ : هەموو نوێژێک

تَقُولُ : دەڵێی، بڵێی

اللَّهُمَّ : ئەی اللَّه

أَعِنِّي : یارمەتیم بدە

عَلَى ذِكْرِكَ : لەسەر زیکر و یادکردنت، لەسەر زیکر و باسی خۆت

وَشُكْرِكَ : وە شوکر کردنت، وە شوکر و سوپاسی خۆت

وَحُسْنِ عِبَادَتِكَ : وە جوان عیبادەت کردنت، باش بەندایەتی کردن بۆت

## ❁ چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١– ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر فەزڵ و گەورەیی موعاذی کوڕی جەبەل

٢– پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زۆری خۆشویستووە

٣– دەستگرتنی هاوەڵان لەلایەن پێغەمبەرەوە ئەوپەڕی خۆ بەکەم زانین و تەواضوعی تێدایە

٤– گەورەیی ئەم زیکرەو واز نەهێنان لێی لەدوای هەموو نوێژە فەرزەکانەوە

٥– داوا کردنی یارمەتی لە اللَّه بۆ ئەوەی یارمەتیت بدات لە عیبادەت و پەرستن دا

## کورتەیەک لە ژیانی پێشەوا موعاذی کوڕی جەبەل

ناوی موعاذی کوڕی جەبەل کوڕی عەمری کوڕی ئەوسە و لە ئەنصارییەکانە، کونیەی موعاذ بریتییە لە ( أبو عبد الرحمن )، لەتەمەنی ١٨ ساڵی دا دەبێتە مسوڵمان، لەوکاتەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەینێرێت بەسەرکردایەتی بۆ یەمەن تەمەنی ٢٨ ساڵە ، یەکێک بووە لەو هاوەڵانەی کە هەموو قورئانی کۆکردۆتەوە و لەبەری کردووە لەسەردەمی پێغەمبەردا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، لە ساڵی ١٨ ی کۆچی دا بە نەخۆشی تاعوون وەفاتي کردووە ئەو کاتی تەمەنی کەمتر لە ٤٠ ساڵ بووە

## ٢٧. پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیک

عَـنْ أَنَـسٍ رَضِـيَ اللَّهُ عَنْـهُ قَـالَ { قَالَـتْ أُمِّـي : يَـا رَسُـولَ اللَّهِ، خَادِمُـكَ أَنَـسٌ ادْعُ اللَّهَ لَـهُ. قَـالَ : اللَّهُـمَّ أَكْثِـرْ مَالَـهُ وَوَلَـدَهُ، وَبَارِكْ لَهُ فِيمَا أَعْطَيْتَهُ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

**واتای فەرموودەکە**: لە ئەنەسـی کوڕی مالیکەوە اللَّه تَعالَی لێی ڕازی بێت فەرموویەتی { دایکم فەرمووی: ئەی پێغەمبەری اللَّه خزمەتکاری تۆیە ئەنەس بپاڕێوە لە اللَّه بۆی. پێغەمبەر صَـلَّی اللَّهُ عَلَیْـهِ وَسَـلَّمَ فەرمووی: ئەی اللَّه تَعالَی ماڵ و موڵکی زیادکەی وە منداڵ و نەوەی زیادکەی وە بەرەکەت داری بکەی بۆی ئەوەی پێت بەخشیوە }

### واتای وشەکان

**قَالَتْ أُمِّي** : دایکم فەرمووی

**يَا رَسُولَ اللَّهِ** : ئەی نێردراوی اللَّه

**خَادِمُكَ** : خزمەتکاری تۆیە، خادمی تۆیە

**أَنَسٌ** : ئەنەسی کوڕی مالیک

**ادْعُ اللَّهَ** : بپاڕێوە لە اللَّه، داوا لە اللَّه تَعالَى بكە

**لَهُ** : بۆی، بۆ ئەنەس ، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ ئەنەس

**قَالَ** : پێغەمبەر فەرمووی

**اللَّهُمَّ** : یا اللَّه، ئەی اللَّه تَعالَى

**أَكْثِرْ** : زیادكەی، زۆری بكەی

**مَالَهُ** : ماڵ و موڵكی، ئەو ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ ئەنەس

**وَوَلَدَهُ** : وە مناڵ و نەوەی، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ ئەنەس

**وَبَارِكْ** : وە بەرەكەت داری بكەی

**لَهُ** : بۆی، بۆ ئەنەسی، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ ئەنەس

**فِيمَا** : لەوەی، لەو شتانەی

**أَعْطَيْتَهُ** : پێت بەخشیوە، ئەوەی ئیعطائت كردووە پێی

## چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١– ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەســەر گەورەیی ئەنەس، چونکە خزمەتکاری پێغەمبەر بووە

٢– گەورەیی دایکی ئەنەس لەلای پێغەمبەرەوە صَــلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَــلَّمَ، بەشێوەیەک داوایەکەی وەڵام دەداتەوە و دوعا دەکات بۆ ئەنەس

٣– ئەم فەرموودەیە نیشــانەیەکە لە نیشــانەکانی پێغەمبەرایەتی چونکە دوعایەکەی قەبووڵ کراوە

٤– دروستییەتی دوعا کردن بۆ زۆربوونی ماڵ و مناڵ و سەروەت و سامان

٥– وەفاو سۆز و خۆشەویستی دایک بۆ مناڵەکەی

قَالَ أَنَسٌ { **فَوَاللَّهِ إِنَّ مَالِي لَكَثِيرٌ، وَإِنَّ وَلَدِي وَوَلَدَ وَلَدِي لَيَتَعَادُّونَ عَلَى نَحْوِ الْمِائَةِ الْيَوْمَ** } رواه مسلم

واتاکەی: ئەنەس فەرموویەتی { ســوێند بە اللَّه بێگومان ماڵ و موڵکم زۆربوو، وە بێگومان ئەمڕۆ مناڵی خۆم و مناڵی مناڵم ١٠٠ مناڵێك دەبێت }

# کورتەیەک لە ژیانی پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیک

ناوی تەواوی بریتییە لە ئەنەسی کوڕی مالیکی کوڕی نەضری کوڕی ضەمضەمی کوڕی زەید، کونییەکەی بریتییە لە أَبُو حَمْزَة، لەو کاتەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هاتە مەدینە ئەنەس تەمەنی ١٠ ساڵ بوو، دایکی ئەنەس هاتە لای پێغەمبەر وتی ئەنەس منالێکە و خزمەتت دەکات پێغەمبەریش قەبوڵی دەکات، بۆیە ئەنەس ١٠ ساڵ خزمەتی کرد، پێغەمبەر گەمەی لەگەڵ ئەنەس دەکرد و پێی دەفەرموو يَا ذَا الأُذُنَيْنِ واتا ئەی خاوەن دوو گوێچکەکە، عەلی کوڕی مەدینی دەفەرمووێت ئەنەس کۆتا صەحابە بوو وەفاتی کرد لە بەصرا پێش ئەوەی ابو طوفەیل وەفات بکات، ئەنەس لەساڵی ٩١ یان ٩٢ یان ٩٣ی کۆچی وەفاتی کردووە لە تەمەنی ٩٩ ساڵی دا، یەکێک بووە لەو حەوت هاوەڵەی کە زۆرترین فەرموودەیان گێڕاوەتەوە ئەویش ٢٢٨٦ فەرموودەیە، ٣١٨ فەرموودەیان هاتووە لە صەحیحەین دا

## ٢٨. گەورەیی أُمِّ سُلَيْمٍ دایكی ئەنەس

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

{ دَخَلْتُ الْجَنَّةَ فَسَمِعْتُ خَشْفَةً ، فَقُلْتُ : مَنْ هَذَا ؟ قَالُوا : هَذِهِ الْغُمَيْصَاءُ بِنْتُ مِلْحَانَ، أُمُّ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ }

مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ واللفظ لمسلم

**واتای فەرموودەکە**: پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی { چومە بەهەشت – لەخەودا – جا گوێم لە جولە و دەنگی ڕۆیشتنێک بوو، وتم ئەوە کێیە؟ مەلائیکەتەکان وتیان ئەوە غومەیصای کچی میلحانە، دایکی ئەنەسی کوڕی مالیک }

### واتای وشەکان

**دَخَلْتُ الْجَنَّةَ** : چوومە بەهەشت ( لەخەوندا )

**فَسَمِعْتُ** : جا گوێم لێ بوو

**خَشْفَةً** : خشپەخشپێك، دەنگ و جوولەی ڕۆیشتن

**فَسَمِعْتُ خَشْفَةً** : جا گوێم له خشپه خشپێک بوو، جا گوێم له ده‌نگی رۆیشتنێك بوو

**فَقُلْتُ** : جا وتم

**مَنْ هَذَا ؟** : ئه‌وه کێیه

**قَالُوا** : وتیان( مه‌لائیکه‌ته‌کان )

**هَذِهِ الْغُمَيْصَاءُ بِنْتُ مِلْحَانَ** : ئه‌وه غومه‌یصای کچی میلحانه

**أُمُّ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ** : دایکی ئه‌نه‌سی کوڕی مالیک

## ۞ چه‌ند سوودێک له‌م فه‌رمووده‌یه‌دا

١ – ئه‌م فه‌رمووده‌یه به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر گه‌وره‌یی دایکی ئه‌نه‌س

٢ – خه‌ونی پێغه‌مبه‌ران ڕاست و دروستن، خه‌ونیان به‌شێکه له وه‌حی

٣– دایکی ئه‌نه‌س ئافره‌تێکی به‌هه‌شتییه

## کورتەیەک لە ژیانی دایکی ئەنەسی کوڕی مالیک

جیاوازی هەیە دەربارەی ناوی دایکی ئەنەسی کوڕی مالیک، وتراوە ناوی سەهلە بووە، وتراوە رومەیلە بووە، وە وتراوە رومەیثە بووە، وتراوە مەلیکە بووە، وە وتراوە غومەیصاء یان ڕومەیصاء بووە، بەڵام لە فەرموودەکەدا بە غومەیصاء ناوی هاتووە، کچی میلحانی کوڕی خالیدی کوڕی زەیدی کوڕی حەڕامی کوڕی جوندوبە، دایکی ئەنەسی خزمەتکاری پێغەمبەرە، کونییەکەی بریتییە لە أُمُّ سُلَيْم بەوەش ناسراوە زیاتر، خێزانی مالیکی کوڕی نەضر بوو لە پێش هاتنی ئیسلام جا ئەنەسی بوو لەو کاتی دا، أُمُّ سُلَيْم هەر لە سەرەتاکان دا مسوڵمان بووە، کە مسوڵمان بوو مالیکی مێردی توڕەبوو و چووە شام هەر لەوێش وەفاتی کرد بە کافری، پاشان أبو طَلحة دێتە خوازبێنی بەڵام أُمُّ سُلَيْم مێردی پێ ناکات چونکە أبو طَلحة کافربوو ئەوکات، أُمُّ سُلَيْم پێی وت مارەییەکەم تەنها مسوڵمان بوونتە بۆیە أبو طَلحةش مسوڵمان دەبێت بەڵام مسوڵمانێکی زۆر باش دەبێت جا ئەو ئافرەتە بەڕێزە دەهێنێت و منالێکیان دەبێت بەناوی أبو عُمَيْر خاوەنی نوغەیر، أُمُّ سُلَيْم یەکێک بووە لە ژیرترین ئافرەتەکان، ئامادەی جەنگی ئوحود و حونەین بووە لەگەڵ پێغەمبەردا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، چەند فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە لە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ چوار فەرموودەیان لە صەحیحەین دا هاتووە

## ٢٩. پێشەوا زەیدی کوڕی ثابت

عَـنْ أَنَـسٍ رَضِـيَ اللَّهُ عَنْـهُ { جَمَـعَ الْقُـرْآنَ عَلَى عَهْـدِ النَّبِـيِّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ أَرْبَعَـةٌ كُلُّهُـمْ مِـنَ الْأَنْصَـارِ؛ أُبَـيٌّ، وَمُعَـاذُ بْـنُ جَبَلٍ، وَ أَبُو زَيْدٍ، وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

**واتای فەرموودەکە**: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە اللَّه لێی ڕازی بێت { چوار کەس لەسەردەمی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قورئانیان کۆ کردۆتەوە و لەبەریان کردووە، هەر چواریشیان لە ئەنصار بوون، ئوبەی کوڕی کەعب و موعاذی کوڕی جەبەل و ئەبو زەید و زەیدی کوڕی ثابت }

### واتای وشەکان

**جَمَعَ الْقُرْآنَ** : قورئانیان کۆ کردۆتەوە، قورئانیان لەبەر کردووە

**عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ** : لەسەردەمی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

**أَرْبَعَةٌ** : چوار هاوەڵ و صەحابە

**كُلُّهُمْ** : هەموویان، هەر چوار هاوەڵیان

**مِنَ الْأَنْصَارِ** : لە ئەنصاربوون، خەڵکی شاری مەدینە بوون

أُبَيٌّ : ئوبەی کوڕی کەعب

وَمُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ : وە موعاذی کوڕی جەبەل

وَ أَبُو زَيْدٍ : وە باوکی زەید، مامی ئەنەسی کوڕی مالیکە

وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ : وە زەیدی کوڕی ثابت

## ۞ چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١ – ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر گەورەیی زەیدی کوڕی ثابت

٢ – ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر فەزڵ و گەورەیی خەریک بوون بە قورئانی پیرۆزەوە

٣ – گرنگیدانی أنصار بە خوێندنەوە و کۆکردنەوەی قورئان

## کورتەیەک لە ژیانی پێشەوا زەیدی کوڕی ثابت

ناوی تەواوی بریتییە لە زەیدی کوڕی ثابتی کوڕی ضەحاکی کوڕی زەید، کونییەکەی بریتییە لە أَبُو سَعید یان أَبُو ثابِت، نوسەری وەحی بووە، زەیدی کوڕی ثابت یەکێک بووە لەو شەش هاوەڵەی زۆرترین فەتوایان داوە ئەوانیش بریتیین لە عومەری کوڕی خەتاب و عەلی کوڕی ئەبووتالیب و ابن مسعود و ئوبەی کوڕی کەعب و ئەبو موسای ئەشعەری و زەیدی کوڕی ثابت، لە ساڵی ٤٥ ی کۆچی دا وەفاتی کردووە، لەو کاتەی وەفاتی کرد ئەبو هورەیرە فەرمووی ئەمڕۆ زانای ئەم ئوممەتە وەفاتی کرد و ئومێد وایە عبداللّه ی کوڕی عەبباس شوێنی بگرێتەوە

## ٣٠. پێشەوا ئەبو دوجانە

عَـنْ أَنَـسٍ ، أَنَّ رَسُـولَ اللَّهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ أَخَـذَ سَـيْفًا يَـوْمَ أُحُـدٍ، فَقَـالَ { مَـنْ يَأْخُـذُ مِنِّـي هَـذَا ؟ فَبَسَـطُوا أَيْـدِيَهُمْ، كُلُّ إِنْسَـانٍ مِـنْهُمْ يَقُـولُ : أَنَـا أَنَـا. قَـالَ : فَمَـنْ يَأْخُـذُهُ بِحَقِّـهِ ؟ قَـالَ: فَـأَحْجَمَ الْقَـوْمُ ، فَقَـالَ سِـمَاكُ بْـنُ خَرَشَـةَ أَبُـو دُجَانَـةَ: أَنَـا آخُـذُهُ بِحَقِّـهِ. قَـالَ : فَأَخَـذَهُ، فَفَلَـقَ بِـهِ هَـامَ الْمُشْـرِكِينَ }
رواه مسلم و أحمد

**واتای فەرموودەکە**: لە ئەنەسـەوە، بێگومان نێردراوی اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ شـمشـێرێکی هەڵگرت لە جەنگی ئوحود دا، جا فەرمووی { چ کەسـێک ئەم شـیرە لەمن وەردەگرێت؟ جا هاوەڵان دەسـتیان درێژکرد، هەموو کەسـێک لەوان ئەیوت: من وەری دەگرم من وەری دەگرم، پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: چ کەسێک شیرەکە وەردەگرێت بەحەق و مافی خۆیەوە؟ ئەنەس فەرمووی جا دواکەوتن و پاشە کشەیان کرد خەڵکەکە، ئەبو دوجانە فەرمووی من وەری دەگرم بە حەق و مافی خۆیەوە، جا شمشێرەکەی وەرگرت و سەری موشریکانی لەت دەکرد و سەریانی پێ دەپەڕاند }

## واتای وشەکان

**أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ** : بێگومان نێردراوی اللَّه

**أَخَذَ** : گرتی

**سَيْفًا** : شیرێک، شمشێرێک، خەنجەرێک

**يَوْمَ أُحُدٍ** : لە ڕۆژی ئوحود، لە ڕۆژی جەنگی ئوحود

**فَقَالَ** : جا فەرمووی

**مَنْ** : کێ ، چ کەسێک

**يَأْخُذُ** : وەردەگرێت

**مِنِّي هَذَا ؟** : لەمن ئەوە، ئەو شیرە لەمن ؟

**فَبَسَطُوا** : جا درێژیان کرد، ڕایان خست

**أَيْدِيَهُمْ** : دەستەکانیان، أَيْدِي جەمع و کۆیە بۆ وشەی يَدْ

**كُلُّ إِنْسَانٍ** : هەموو مرۆڤێک، هەر ئینسانێک، هەموو هاوەڵێک

**مِنْهُمْ** : لەوان، لە هاوەڵان

**يَقُولُ** : دەیوت

**أَنَا أَنَا** : ئەمن ئەمن، ئەمن وەری دەگرم

**قَالَ** : فەرمووی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

**فَمَنْ** : جا کێ ، جا چ کەسێک

**يَأْخُذُهُ** : وەری دەگرێت، شـــیرەکە وەر دەگرێت، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ سَيْفاً

**بِحَقِّهِ ؟** : بە حەق و مافی خۆی، واتا حەقی شـیرەکە بدات بە پەڕاندن و لەت کردنی سەری موشریکان، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ سَيْفَاً

**قَالَ** : فەرمووی ئەنەس

**فَأَحْجَمَ الْقَوْمُ** : پاشە کشەیان کرد خەڵکەکە ، دواکەوتن خەڵکەکە

**فَقَالَ سِـــمَاكُ بْنُ خَرَشَـــةَ أَبُو دُجَانَةَ** : جا فەرمووی ســـیماکی کوڕی خەرەشە، کونییەکەی ئەبو دوجانەیە

**أَنَا آخُذُهُ** : ئەمن شیرەکە وەردەگرم، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ سَيْفَاً

**آخُذُ** : وەردەگرم

**بِحَقِّهِ** : بەحەق و مافی خۆی، بەحەق و مافی ئەوەی سەری موشریکانی پێ لەت کەم، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ سَيْفَاً

**قَالَ** : فەرمووی ئەنەس

**فَأَخَذَهُ** : جا شیرەکەی وەرگرت، ئەبو دوجانە شیرەکەی وەرگرت

**فَفَلَقَ بِهِ** : جا لەتی دەکرد بەشیرەکە، شـەقی دەکرد بەهۆی ئەو شیرە، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ سَيْفَاً

**هَامَ الْمُشْرِكِينَ** : سەری موشریک و هاوبەش دانەران

## چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١– ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر گەورەیی پێشەوا ئەبو دوجانە

٢– ئازایەتی هاوەڵی بەڕێز ئەبو دوجانەی تێدایە

٣– سووربوونی هاوەڵان لەسەر خێرو چاکە

٤– مافی وەرگرتنی شیرەکەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ پەڕاندنی سەری موشریک و هاوبەش دانەران بوو

## کورتەیەک لە ژیانی پێشەوا ئەبو دوجانە

ناوی بریتییە لە سیماکی کوڕی خەرەشە، کونییەکەی بریتییە لە أَبُو دُجَانة، ئامادەی جەنگی بەدر و ئوحود بووە، لە جەنگی ئوحود بەخۆیی و موصعەبی کوڕی عومەیر بەرگرییەکی زۆریان کرد لە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەوەبوو موصعەب لەشەڕەکەدا شەهید کرا و ئەبو دوجانەش بریندار کرا لە چەندین شوێنی لاشەی دا، هاوەڵێکی زۆر ئازا و چاونەترس بوو، لە جەنگی یەمامەدا شەهید دەکرێت والله أعلم

## ٣١. پێشەوا ئەبو موسای ئەشعەری

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ { يَا أَبَا مُوسَى، لَقَدْ أُعْطِيتَ مِزْمَارًا مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ } رواه البخاري و مسلم والنسائي و الدارمي و أحمد والترمذي واللفظ له

**واتای فەرموودەکە**: پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی { ئەی ئەبو موسا، بێگومان پێت بەخشراوە دەنگ خۆشێک لە دەنگ خۆشییەکانی نەوەی داود عليه السلام }

### واتای وشەکان

**يَا أَبَا مُوسَى** : ئەی ئەبو موسا

**لَقَدْ** : بێگومان

**أُعْطِيتَ** : پێت بەخشراوە

**مِزْمَارًا** : دەنگێکی خۆش و چاك، خۆی مزمار ئالەتێکی مۆسیقایە وەک شمشاڵ و بلوێر و زوڕنایە

**مِنْ مَزَامِيرِ** : لە دەنگ خۆشییەکانی

**آلِ دَاوُدَ** : نەوەی داود، مەبەســـت لێرە خوودی پێغەمبەر داودە علیە الســـلام، چونکە نەهاتووە منداڵێکی داود یان نزیکەکانی داود دەنگیان خۆش بوو بێت

## ۞ چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١– ئەم فەرموودەیە گەورەیی ئەبو موســـای ئەشـــعەری تێدایە بەوەی کەوا دەنگێکی زۆر خۆشـــی هەبووە لە قورئان، پێغەمبەر صَـــلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـــلَّمَ حەزی بەدەنگی کردووە

٢– سوننەتە خوێندنەوەی قورئان بەدەنگێکی خۆش و جوان

٣– وە پێغەمبەر داود علیە الســـلام دەنگێکی زۆر خۆشـــی هەبووە لە خوێندنەوەی زەبوور

# کورته‌یه‌ک له ژیانی پێشه‌وا ئه‌بو موسای ئه‌شعه‌ری

ناوی ته‌واوی بریتییه له عبدالله ی کوڕی قه‌یسی کوڕی سوله‌یمی کوڕی حه‌ضاری کوڕی حه‌ربی کوڕی عامر، کونییه‌که‌ی بریتییه له ئه‌بو موسای ئه‌شعه‌ری به‌وه‌ش ناسراوه زیاتر، له‌دوای فه‌تحی خه‌یبه‌ر دێته شاری مه‌دینه، ئه‌بو موسای ئه‌شعه‌ری له بالآیدا که‌سێکی کورت بووه، وه ده‌نگێکی زۆر خۆشی هه‌بووه له قورئان، پێشه‌وا عومه‌ری کوڕی خه‌تاب ئه‌گه‌ر ده‌یدیت پێی ده‌فه‌رموو ذَكِّرْنا رَبَّنَا يَا أَبَا مُوسَى واتا: په‌روه‌ردیگارمان یادخه‌ره‌وه ئه‌ی ئه‌بو موسا جا ئه‌بو موساش قورئانی بۆ ده‌خوێنده‌وه، ئه‌بو موسای ئه‌شعه‌ری یه‌كێک بووه له شاره‌زایانی دین و قورئان، پێشه‌وا شه‌عبی ده‌فه‌رموێت علم و زانست کۆتایی هاتووه له‌لای شه‌ش که‌سه‌وه یه‌كێک له‌و شه‌ش که‌سه ئه‌بو موسای ئه‌شعه‌رییه، پێشه‌وا حه‌سه‌نی به‌سری فه‌رموویه‌تی: هیچ سوارچاكێک نه‌هاتۆته به‌سره باشتر بووبێت بۆ خه‌ڵكی به‌سره له ئه‌بو موسای ئه‌شعه‌ری، له ساڵی ٤٢ یان ٤٤ی کۆچی دا وه‌فاتی کردووه له ته‌مه‌نی شه‌ست ئونده ساڵه‌دا، قورتوبی ده‌ڵێت ٦٦٠ فه‌رمووده‌ی گێڕاوه‌ته‌وه له پێغه‌مبه‌ر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ٦٨ فه‌رمووده‌یان له صه‌حیحه‌ین دا هاتووه

ئه‌بو موسای ئه‌شعه‌ری له فه‌رمووده‌یه‌کی تری صه‌حیح دا

- ئه‌بو موسای ئه‌شعه‌ری دوعای لێخۆشبوون و چوونه به‌هه‌شتی بۆ کراوه له‌لایه‌ن پێغه‌مبه‌ره‌وه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ { **اللَّهُمَّ اغْفِرْلِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ قَيْسٍ ذَنْبَهُ، وَأَدْخِلْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُدْخَلًا كَرِيمًا** } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واتای فەرموودەکە: پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی { ئەی اللّٰه لە عبد اللّٰەی کوڕی قەیس - ئەبو موسای ئەشعەری - خۆشببەو بیخەرە بەهەشتەوە بەڕێزەوە }

## ٣٢. پێشه‌وا زه‌یدی کوڕی حاریثه

عَـنْ عَبْـدِ اللَّهِ بْـنِ عُمَـرَ رَضِـيَ اللَّهُ عَنْهُمـا قَـالَ { مَـا كُنَّـا نَـدْعُو زَيْـدَ بْـنَ حَارِثَـةَ إِلَّا زَيْـدَ ابْـنَ مُحَمَّـدٍ حَتَّـى نَزَلَـتِ : { ادْعُـوهُمْ لِآبَـائِهِمْ هُـــوَ أَقْسَـــطُ عِنْـــدَ اللَّهِ } } رواه البخـــاري و مســـلم والترمـــذي واللفظ له

**واتـای فه‌رمووده‌كه**: له عبداللَّه‌ی کوڕی عومه‌ره‌وه اللَّه تَعالَى لێیان ڕازی بێت فه‌رموویه‌تی { ئێمه بانگمان نه‌ده‌کرد به زه‌یدی کوڕی حاریثه، ته‌نها به‌ناوی زه‌یدی کوڕی موحه‌ممه‌د نه‌بێت، هه‌تا ئه‌م ئایه‌ته دابه‌زی { به‌ناوی باوکیان بانگیان بکه‌ن ئه‌وه دادپه‌روه‌رانه‌تره له‌لای اللَّه تَعالَى یه‌وه } }

### واتای وشه‌کان

**مَا كُنَّا نَدْعُو** : ئێمه بانگمان نه‌ده‌کرد، ئێمه ناومان نه‌ده‌هێنا

**زَيْدَ بْنَ حَارِثَةَ** : زه‌یدی کوڕی حاریثه، به‌ناوی زه‌یدی کوڕی حاریثه

**نَدْعُو** : بانگمان ده‌کرد، ناومان ده‌هێنا

**إِلَّا** : جگە ، بێجگە، تەنها

**زَيْدَ ابْنَ مُحَمَّدٍ** : بەزەیدی کوڕی موحەممەد، واتا بەناوی باوکی خۆی بانگمان نەدەکرد بەڵکو بەکوڕی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بانگمان دەکرد

**حَتَّى** : تا ئەوکاتەی، هەتا

**نَزَلَت** : دابەزی، هاتە خوار

## ۞ چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١– ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر گەورەیی زەیدی کوڕی حاریثە، بەشێوەیەک پێغەمبەر زۆری خۆشویستووە هەتا کردبوویە کوڕی خۆی

٢– ئەم ئایەتە پیرۆزە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نەسخ بۆتەوە کوڕی یەکێکی تر بکەیتە کوڕی خۆت

٣– درووست نیە ئێستا نەسەبی هیچ کەسێکی تر بگۆڕی و بە کوڕی کەسێکی تری بانگ بکەیت جگە لە نەسەبی حەقیقی خۆی، ئەمەش کۆدەنگی زانایانی لەسەرە

## کورتەیەک لە ژیانی پێشەوا زەیدی کوڕی حاریثە

ناوی تەواوی بریتییە لە زەیدی کوڕی حاریثەی کوڕی شەراحیلی کوڕی عبد العزای کوڕی زەید، حەکیمی کوڕی حیززام بۆ خەدیجەی کڕی بوو بە ٤٠٠ دیرهەم جا کاتێک دایکمان خەدیجە شووی کرد بە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زەیدی کوڕی حاریثەی بە دیاری پێشکەشی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کرد، پێغەمبەریش زۆری خۆشدەویست و کردبوویە کوڕی خۆی، باوکی زەید لەو کاتەی زەیدی لە دەست دا زۆر بێتاقەت بوو و گریا پاشان وتی

بَكَيْتُ عَلَى زَيْدٍ وَلَمْ أَدْرِ ما فَعَلْ

أَحَيٌّ فَيُرْجَى أَمْ أَتَى دُونَهُ الأَجَلْ

فَوَ اللَّهِ ما أَدْري وإِنْ كُنْتُ سائِلاً

أَغالَكَ بَعْدِي السَهْلُ أم غَالَكَ الجَبَلْ

فَيَالَيْتَ شِعْري هَلْ لَكَ الدَّهْرَ رَجْعَةٌ

فَحَسْبِي مِنَ الدُّنيا رُجُوعُكَ لِي بَجَلْ

تُذَكِّرُنيهِ الشَّمْسُ عِنْدَ طُلُوعِها

وَتُعْرِضُ ذِكْراهُ إذا غَرْبُها أَفَلْ

وَإِنْ هَبَّتِ الأَرْواحَ هَيَّجْنَ ذِكْرَهُ

فَيا طُولَ ما حُزْني عليهِ وَمَا وَجَلْ

سَأَعْمَلُ نَصَّ العِيسِ فِي الأَرْضِ جاهِداً

وَلا أَسْأَمَ التَّطْوافَ أَوْ تَسْأَمَ الإِبِلْ

حَياتِي أَوْ تَأْتِي عَلَيَّ مَنِيَّتِي

فَكُلُّ امْرِىءٍ فَانٍ وَإِنْ غَرَّهُ الأَمَلْ

پێشـــەوا زوهری فەرموویەتی { مَا نَعْلَمُ أَنَّ أَحَدَاً أَسْـــلَمَ قَبْلَ زَيْدِ بْنِ الحَارِثَةَ } واتا: نەمانزانیوە هیچ کەسێک مسوڵمان بوو بێت پێش زەیدی کوڕی حاریثە، زەیدی کوڕی حاریثە یەکێک بووە لەو کەســانەی بەژداری شــەڕی بەدریشــی کردووە، پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەربارەی زەید فەرموویەتی { وَإِنْ كَانَ لَمِنْ أَحَبِّ النَّاسِ إِلَيَّ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ ، واتاکەی: ئەگەر چی زەیدی کوڕی حاریثە لە خۆشــەویســترین کەســی منە، بە کۆدەنگی هەموو زانایان هیچ هاوەڵێک نــاوی لە قورئـان نەهـاتووە بە نـاوی خۆی جگە لە زەیـدی کوڕی حـاریثە، هەروەک اللَّه تَعالَى فەرموویەتی { فَلَمَّا قَضَـىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَاكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَرًا ۚ وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ مَفْعُولًا }[ سورة الأحزاب : ٣٧ ]

زەیدی کوڕی حاریثە لە شەڕی موئتە دەکوژرێت و وەفات دەکات، اللَّه تَعالَى بە فیردەوسی شاد کات خۆشەویستەکەی خۆشەویستمان

## ٣٣. گەورەیی ئوسامەی کوڕی زەید

عَـنْ أُسَـامَةَ بْـنِ زَيْـدٍ رَضِـيَ اللَّهُ عَنْهُمَـا، حَـدَّثَ عَـنِ النَّبِـيِّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْــهِ وَسَــلَّمَ { أَنَّــهُ كَــانَ يَأْخُــذُهُ وَالْحَسَــنَ فَيَقُــولُ : اللَّهُــمَّ أَحِبَّهُمَا ؛ فَإِنِّي أُحِبُّهُمَا } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

**واتای فەرموودەکە**: لە ئوســـامەی کوڕی زەیدەوە اللَّه تَعالَى لەخۆیی و باوکی ڕازی بێت گێڕایتییەوە لە پێغەمبەرەوە صَــلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَــلَّمَ، بێگومان پێغەمبەر صَــلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَــلَّمَ ئوســـامەی کوڕی زەیدو حەســـەنی کوڕی عەلی هەڵـدەگرت، جـا دەیفەرموو ئەی اللَّه تَعـالَى ئوسامە و حەسەنت خۆش بوێن بێگومان من خۆشم دەوێن }

## واتای وشەکان

**حَدَّثَ** : گێڕایەوە، باسی کردووە

**عَنِ النَّبِيِّ** : لە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

**أَنَّهُ** : بێگومان پێغەمبەر، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ النَّبِيِّ

**يَأْخُذُهُ** : هەڵی دەگرێت، ئوسامە هەڵدەگرێت

**وَالْحَسَنَ** : وە حەسەن هەڵدەگرێت

**فَيَقُولُ** : جا دەیفەرموو

**اللَّهُمَّ** : ئەی اللّه

**أَحِبَّهُمَا** : خۆشت بوێن، ئوسامە و حەسەنت خۆش بوێن، وشەی هُمَا دەگەڕێتەوە بۆ ئوسامە و حەسەن

**فَإِنِّي** : جا بێگومان من

**أُحِبُّهُمَا** : خۆشم دەوێن، ئوسامە و حەسەنم خۆش دەوێن

## ۞ چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١ – ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر گەورەیی پێشەوا ئوسامەی کوڕی زەید

٢ – ئوسامە یەکێک بووە لە زۆر خۆشەویستەکانی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

## کورتەیەک لە ژیانی پێشەوا ئوسامەی کوڕی زەید

ناوی تەواوی بریتییە لە ئوسامەی کوڕی زەیدی کوڕی حاریثەی کوڕی شەراحیلی کوڕی زەید، ئوسامە خۆشەویستی کوڕی خۆشەویستی پێغەمبەرە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، کونییەکەی بریتییە لە أَبُو مُحَمَّد، وە پێشی دەوترا أَبُو زَيْد، وە أُمُّ أَيْمَن دایکی ئوسامەی بووە و ئافرەتێکی زۆر بەڕێز بووە لەلای پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ئوسامە لەناو ئیسلام لە دایک بووە، لەو کاتەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وەفاتی کرد تەمەنی ٢٠ ساڵ بوو، پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی دەربارەی ئوسامە { وَإِنَّ هَذَا لَمِنْ أَحَبِّ النَّاسِ إِلَيَّ بَعْدَهُ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، واتاکەی: بێگومان ئوسامەی کوڕی زەید لە خۆشەویسترینی خەڵکیە لەلای من لەدوای باوکییەوە کە زەیدی کوڕی حاریثەیە، ئوسامەی کوڕی زەید دوورکەوتەوە و ئیعتیزالی کرد لەدوای کوشتنی عوثمانی کوڕی عەفان تا ئەو کاتەی وەفاتی کرد لە کۆتاییەکانی خیلافەتی پێشەوا موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان دا، لە ساڵی ٥٤ ی کۆچی دا وەفاتی کردووە لە شاری مەدینەی خۆشەویست.

## ٣٤. گەورەیی دایکی ئەیمەن و ئوسامە

عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ بَعْدَ وَفَاةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِعُمَرَ { انْطَلِقْ بِنَا إِلَى أُمِّ أَيْمَنَ نَزُورُهَا، كَمَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَزُورُهَا. فَلَمَّا انْتَهَيْنَا إِلَيْهَا بَكَتْ، فَقَالَا لَهَا: مَا يُبْكِيكِ ؟ مَا عِنْدَ اللَّهِ خَيْرٌ لِرَسُولِهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. فَقَالَتْ: مَا أَبْكِي أَنْ لَا أَكُونَ أَعْلَمُ أَنَّ مَا عِنْدَ اللَّهِ خَيْرٌ لِرَسُولِهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلَكِنْ أَبْكِي أَنَّ الْوَحْيَ قَدِ انْقَطَعَ مِنَ السَّمَاءِ. فَهَيَّجَتْهُمَا عَلَى الْبُكَاءِ، فَجَعَلَا يَبْكِيَانِ مَعَهَا } رواه مسلم

**واتای فەرموودەکە**: لە ئەنەسەوە فەرموویەتی: ئەبو بەکری صدیق دوای وەفاتی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بە عومەری کوڕی خەتابی فەرموو { با بڕۆین بۆلای دایکی ئەیمەن سەردانی بکەین، هەروەکوو چۆن پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سەردانی دەکرد، جا لەوکاتەی کە گەیشتینە لای دایکی ئەیمەن گریا، جا پێیان وت چ شتێک تۆی گریاند؟ ئەوەی لەلای اللّٰەیە باشترە بۆ پێغەمبەرەکەی صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، جا دایکی ئەیمەن وتی: بۆ ئەوە ناگریم کە نەزانم ئەوەی لەلای اللّٰەیە باشترە

بۆ پێغەمبەرەکەی، بەڵام بۆ ئەوە دەگریم چونکە بێگومان وەحی پچڕا و نەما لە ئاسمانەوە، ئەوانیشی هاندا لەسەر گریان، جا ئەوانیش دەستیان کرد بە گریان لەگەڵی }

## واتای وشەکان

قَالَ أَبُو بَكْرٍ : ئەبوو بەکری صدیق فەرمووی

بَعْدَ وَفَاةِ رَسُولِ اللَّهِ : لەدوای مردنی نێردراوی اللّٰه

لِعُمَرَ : بە عومەری کوڕی خەتاب

انْطَلِقْ بِنَا : با بڕۆین

إِلَى أُمِّ أَيْمَنَ : بۆلای دایکی ئەیمەن

نَزُورُهَا : سەردانی بکەین، سەردانی دایکی ئەیمەن بکەین، ئەو هایە دەگەڕێتەوە بۆ أُمِّ أَيْمَنَ

كَمَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ : هەروەکوو چۆن نێردراوی اللّٰه

يَزُورُهَا : سەردانی دەکرد، ئەو هایە دەگەڕێتەوە بۆ أُمِّ أَيْمَنَ

فَلَمَّا : جا لەوکاتەی

انْتَهَيْنَا : گەیشتین

إِلَيْهَا : بۆلای دایکی ئەیمەن، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ أُمِّ أَيْمَنَ

بَكَتْ : گریا، دایکی ئەیمەن گریا

فَقَالَا : جا وتیان، ئەبو بەکر و عومەر وتیان

لَهَا : بە دایکی ئەیمەن، ئەو هایە دەگەڕێتەوە بۆ أُمِّ أَيْمَنَ

مَا يُبْكِيكِ ؟ : چی تۆی گریاند ؟

مَا عِنْدَ اللَّهِ : ئەوەی لەلای اللَّهیە

خَيْرٌلِرَسُولِهِ : باشترە بۆ پێغەمبەرەکەی

فَقَالَتْ : جا وتی، جا دایکی ئەیمەن وتی

مَا أَبْكِي : ناگرییێم

أَنْ لَا أَكُونَ أَعْلَمُ : کە ئەمن نەزانم

أَنَّ مَا : بێگومان ئەوەی

عِنْدَ اللَّهِ : لەلای اللَّهیە

خَيْرٌلِرَسُولِهِ : باشترە بۆ پێغەمبەرەکەی

لَكِنْ : بەڵام

أَبْكِي : دەگریم

أَنَّ الْوَحْيَ : بێگومان وەحی، سرووشت

إنقَطَعَ : پچڕا

**مِنَ السَّمَاءِ** : لە ئاسمان

**فَهَيَّجَتْهُمَا** : جا هانیدان، ئەبو بەکر و عومەری هاندا

**عَلَى الْبُكَاءِ** : لەسەر گریان

**فَجَعَلَا يَبْكِيَانِ** : دەستیان کردە گریان، جا وایان کرد بگریێن

**مَعَهَا** : لەگەڵ دایکی ئەیمەن، ئەو هایە دەگەڕێتەوە بۆ أُمِّ أَيْمَنَ

## ۞ چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١– ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر فەزڵ و گەورەیی دایکی ئەیمەن

٢– سەردانی کردنی ژن و پیاوی ساڵح کارێکی چاکە

٣– ژیری و دینداری دایکی ئەیمەن کەوا بۆ ئەوە دەگری چیتر وەحی دانابەزێتە سەر زەوی

٤– دروستە بۆ پیاو و بۆ ژنیش ئەگەر هەواڵێکی ناخۆشی پێدرا دەست بکات بە گریان، بەتایبەت هەواڵی ناخۆش لە دیندا

## کورتەیەک لە ژیانی دایکی ئەیمەن

ناوی تەواوی بریتییە لە بەرەکەی کچی ثەعلەبەی کوڕی عەمری کوڕی حیصنی کوڕی مالیکی کوڕی سەلەمە، کونییەکەی بریتییە لە أُمُّ أَیْمَن، وەکوو دایک وا بووە بۆ پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و پەروەردەی کردووە تا گەورە دەبێت، دایکی ئەیمەن خێزانی عوبەیدی کوڕی زەید بوو و ئەیمەنی لەو بووە، پاشان مێرد دەکات بە زەیدی کوڕی حاریثە لەدوای هاتنی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وە ئوسامەی لە زەید دەبێت، لەو کاتەی پێغەمبەر وەفاتی کرد گریا و فەرمووی وەحی پچڕا، لەو کاتەی عومەری کوڕی خەتاب شەهید کرا گریا فەرمووی ئیسلام بەرەو لاوازی دەڕوات، ٢٠ ڕۆژ دوای وەفاتی پێشەوا عومەر وەفات دەکات

## ٣٥. پێشەوا عوکاشەی کوڕی میحصەن

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

{يَدْخُلُ مِنْ أُمَّتِي الْجَنَّةَ سَبْعُونَ أَلْفًا بِغَيْرِ حِسَابٍ " فَقَالَ رَجُلٌ : يَا رَسُولَ اللَّهِ، ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ. قَالَ : اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ مِنْهُمْ " ثُمَّ قَامَ آخَرُ، فَقَالَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ، ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، قَالَ : سَبَقَكَ بِهَا عُكَّاشَةُ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

**واتای فەرموودەکە**: پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی { لە ئوممەتەکەم حەفتا هەزار کەس دەچنە بەهەشتەوە بەبێ حیساب و لێپرسینەوە، جا پیاوێک — عوکاشە — فەرمووی: ئەی نێردراوی اللَّه داوا لە اللَّه بکە من لەوان بگێڕێت، پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی ئەی اللَّه تَعالَى ئەو پیاوە– عوکاشە — لەوان بگێڕە، لە پاشان پیاوێکی تر هەستا، جا فەرمووی ئەی نێردراوی اللَّه داوا بکە منیش لەوان بم، پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی عوکاشە پێشە تۆ کەوت — لەم پلە و داوایە دا — }

## واتای وشەکان

**يَدْخُلُ** : دەچێتە ناو، داخل دەبێت

**مِنْ أُمَّتِي** : لە ئوممەتەکەم

**الْجَنَّةَ** : بەهەشت

**سَبْعُونَ أَلْفًا** : حەفتا هەزار ( کەس )

**بِغَيْرِ حِسَابٍ** : بەبێ حیساب و لێپرسینەوە

**فَقَالَ رَجُلٌ** : جا پیاوێک فەرمووی، عوکاشەی کوڕی میحصەن فەرمووی

**يَا رَسُولَ اللَّهِ** : ئەی نێردراوی اللَّه

**ادْعُ اللَّهَ** : داوا بکە لە اللَّه ، بپاڕێوە لە اللَّه

**أَنْ يَجْعَلَنِي** : وام لێ بکات، بمگێڕێت

**مِنْهُمْ** : لەوان، لەو حەفتا هەزار کەسە، هُمْ دەگەڕێتەوە بۆ سَبْعُونَ أَلْفًا

**قَالَ** : فەرمووی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

**اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ** : ئەی اللَّه بیگێڕە، ئەی اللَّه وای لێبکە، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ رَجُلٌ

**مِنْهُمْ :** له‌وان، وشه‌ی هُمْ ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ سَبْعُونَ أَلْفًا

**ثُمَّ قَامَ آخَرُ** : له‌پاشان هه‌ستا یه‌كێكی تر

**فَقَالَ** : جا فه‌رمووی

**يَا رَسُولَ اللَّهِ** : ئه‌ی نێردراوی اللَّه

**ادْعُ اللَّهَ** : داوا له اللَّه بكه ، بپاڕێوه له اللَّه

**أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ** : منیش له‌وان بگێڕێت، وام لێ بكات له‌وان بم

**قَالَ** : پێغه‌مبه‌ر فه‌رموو

**سَبَقَكَ** : پێشه تۆ كه‌وت، پێشت كه‌وت

**بِهَا** : به‌و داوایه، به‌و پله‌یه

**عُكَّاشَةُ** : عوكاشه‌ی كوڕی میحصه‌ن، عُكَّاشَة به دوو شێوه ده‌خوێندرێته‌وه به شه‌دده‌ی كافه‌كه عُكَّاشَة وه به‌بێ شه‌دده‌ی كافه‌كه عُكَاشَة

## چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١– کۆمەڵێک لەم ئوممەتە دەچنە بەهەشتەوە بەبێ حیساب و لێپرسینەوە

٢– فەزڵ و گەورەیی ئەو ئوممەتە

٣– فەزڵێکی گەورەیە بۆ پێشەوا عوکاشە کەوا بەبێ حیساب و سزا دەچێتە بەهەشتەوە

٤– جوانی هەڵس و کەوتی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کە بەپیاوی دووەمی نەوت تۆ لەو حەفتا هەزار کەسە نیت بەڵکو وتی عوکاشە پێشە تۆ کەوت لەم داوایەدا

٧٠ هەزار کەس دەچنە بەهەشتەوە بەبێ حیساب و لێپرسینەوە ئەوە گومانی تێدا نییە، بەڵام فەرموودەی هەر هەزار کەس لەو ٧٠ هەزار کەسە ٧٠ هەزار کەسی تر لەگەڵ خۆیدا دەباتە بەهەشت ئەوەیان قسە هەیە لەسەر صەحیحی و ضەعیفیەکەی دا

## کورتەیەک لە ژیانی پێشەوا عوکاشە

ناوی تەواوی عوکاشەی کوڕی میحصەنی کوڕی حورثانی کوڕی قەیسی کوڕی موڕارەیە، کونییەکەی بریتییە لە أَبُو مِحْصَن، پیاوێکی زۆر جوان بووە، لە مسوڵمانە سەرەتایەکانە، ئامادەی شەڕی بەدریش بووەو شەڕێکی زۆر توند و تیژی کردووە تا شیرەکەی کەرت دەبێت لە دەستی دا، ئیبن ئیسحاق دەفەرمووێت پێم گەیشتووە کە پێغەمبەر فەرموویەتی { خَيْرُ فَارِسٍ فِي الْعَرَبِ عُكَّاشَة } واتا: باشترین سوارچاک لەناو عەرەب دا عوکاشەیە، عوکاشە شەهید دەبێت لەشەڕی ڕیددەدا لە ساڵی ١٢ ی کۆچی دا

## ٣٦. پێشه‌وا خالیدی کوڕی وه‌لید

عَـنْ أَنَـسٍ رَضِـيَ اللَّهُ عَنْـهُ، أَنَّ النَّبِـيَّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ نَعَـى زَيْـدًا، وَجَعْفَـرًا، وَابْـنَ رَوَاحَـةَ لِلنَّـاسِ قَبْـلَ أَنْ يَـأْتِيَهُمْ خَبَـرُهُمْ، فَقَـالَ {أَخَـذَ الرَّايَـةَ زَيْـدٌ فَأُصِـيبَ، ثُـمَّ أَخَـذَ جَعْفَـرٌفَأُصِـيبَ، ثُـمَّ أَخَـذَ ابْـنُ رَوَاحَـةَ فَأُصِـيبَ - وَعَيْنَـاهُ تَـذْرِفَانِ – حَتّـَى أَخَـذَ سَـيْفٌ مِـنْ سُيُوفِ اللَّهِ حَتَّى فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ } رواه البخاري و أحمد

**واتای فه‌رمووده‌كه**: له ئه‌نه‌سه‌وه اللَّه تَعالَى لێی ڕازی بێت، بێگومان پێغه‌مبه‌ر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ هه‌واڵی مردنی زه‌ید و جه‌عفه‌ر و ئیبن ڕه‌واحه‌ی ڕاگه‌یاند پێش ئه‌وه‌ی هه‌واڵی مردنیان بێت بۆ خه‌ڵكه‌كه، جا پێغه‌مبه‌ر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ فه‌رمووی { زه‌ید ئاڵاكه‌ی هه‌ڵگرت جا به‌ری ده‌كه‌وێت و شه‌هید ده‌كرێت، پاشان جه‌عفه‌ر ئاڵاكه هه‌ڵده‌گرێت و به‌ری ده‌كه‌وێت و شه‌هید ده‌كرێت، پاشان ئیبن ڕه‌واحه ئاڵاكه هه‌ڵده‌گرێت و به‌ری ده‌كه‌وێت و شه‌هید ده‌كرێت- وه دوو چاوه‌كه‌ی پێغه‌مبه‌ر فرمێسكی پێدا ده‌هاتنه خواره‌وه - هه‌تا شمشێرێك له شمشێره‌كانی اللَّه ئاڵاكه‌ی هه‌ڵگرت تاوه‌كو اللَّه تعالى ده‌رگای به‌سه‌ر مسوڵمانان كردووه و سه‌ری خستن }

## واتای وشەکان

أَنَّ النَّبِيَّ : بێگومان پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

نَعَى زَيْدًا وَجَعْفَرًا وَ ابْنَ رَوَاحَةَ : هەواڵی مردنی زەید و جەعفەر و ئیبن ڕەواحەی ڕاگەیاند لە شەڕی موئتە دا

لِلنَّاسِ : بەخەڵکی، بۆ خەڵکی

قَبْلَ أَنْ يَأْتِيَهُمْ : پێش ئەوەی بێت بۆیان، پێش ئەوەی بۆ خەڵکی بێت وشەی هُمْ دەگەڕێتەوە بۆ النَّاس

خَبَرُهُمْ : هەواڵیان، خەبەریان، هەواڵی مردنی زەید و جەعفەر و ئیبن ڕەواحە

فَقَالَ : جا فەرمووی، پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی

أَخَذَ الرَّايَةَ : ئاڵاکەی گرت، ئاڵاکەی هەڵگرت

زَيْدٌ : زەیدی کوڕی ثابت

فَأُصِيبَ : جا بەری دەکەوێت، شەهید دەکرێت

ثُمَّ : پاشان

أَخَذَ جَعْفَرٌ : هەڵی گرت جەعفەر، جەعفەری کوڕی ئەبووتالیب ئاڵاکەی هەڵگرت

فَأُصِيبَ : جا بەری دەکەوێت، شەهید دەکرێت

ثُمَّ : پاشان

أَخَذَ ابْنُ رَوَاحَةَ : هەڵی گرت ئیبن ڕەواحە، ئاڵاکەی هەڵگرت عَبْدُ اللَّەی کوڕی ڕەواحە

فَأُصِيبَ : جا بەری دەکەوێت، شەهید دەکرێت

وَعَيْنَاهُ تَذْرِفَانِ : وە دوو چاوەکەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فرمێسکی پێدا دەهاتنە خوارەوە، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ النَّبي

حَتَّى : هەتا، تا ئەوکاتەی

أَخَذَ : هەڵی گرت، ئاڵاکەی هەڵگرت

سَيْفٌ : شیرێک، شمشێرێک، خەنجەرێک

مِنْ سُيُوفِ اللَّهِ : لە شمشێرەکانی اللَّه

حَتَّى : هەتا، تاوەکوو

فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ : اللَّه دەرگای بەسەردا کردنەوە و سەری خستن، ضەمیری عَلَيْهِمْ دەگەڕێتەوە بۆ المُسلمین، واتا دەرگای بەسەر مسوڵمانان کردەوە و سەری خستن واللَّه أعلم، وە وتراوە ضەمیری عَلَيْهِمْ دەگەڕێتەوە بۆ المُشرکین، واتا اللَّه سەر خستن بەسەر موشریک و هاوبەش دانەران دا

##  چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١– ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر گەورەیی پێشەوا خالیدی کوڕی وەلید

٢– سۆزو خۆشەویستی پێغەمبەر بۆ هاوەڵەکانی

٣– نازناوی شمێری اللَّە بۆ خالیدی کوڕی وەلید لەلایەن پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

٤– ئازایەتی هاوەڵان و خۆ فیداکردنیان بۆ سەرخستنی دینە جوانەکەی اللَّە تَعالَى

## کورتەیەک لە ژیانی پێشەوا خالیدی کوڕی وەلید

ناوی تەواوی بریتییە لە خالیدی کوڕی وەلیدی کوڕی موغیرەی کوڕی عبداللَّەی کوڕی عومەری کوڕی مەخزوم، کونییەکەی بریتییە لە أَبُو سُليمان، لەقەب و نازناوی بریتییە لە سَيْفُ اللَّه، لەدوای حودەیبیە مسولْمان بووە و ئامادەی شەڕی موئتە بووە هەر لەم شەڕەش دا نازناوی شمێری اللَّەی پێ بەخشرا لەلایەن پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، لەزۆرێک لە شەڕەکان ئامادە بووە و یەکێک بووە لە ئازاترینی هاوەڵەکان، لە ساڵی ٢١ ی کۆچی یان ٢٢ی کۆچی دا وەفاتی کردووە لە حیمص

## ٣٧. پێشەوا جەریری کوڕی عبد اللّه

عَـنْ جَرِيـرٍ رَضِـيَ اللَّهُ عَنْـهُ، قَـالَ { مَـا حَجَبَنِـي النَّبِـيُّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ مُنْـذُ أَسْـلَمْتُ، وَلَا رَآنِـي إِلَّا تَبَسَّـمَ فِي وَجْهِـي } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

**واتـای فەرموودەکە**: لە جەریـرەوە اللَّه تَـعـالَـی لـێـی ڕازی بـێـت فەرموویەتی { پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ هەرگیز ڕێگری لەمن نەکردووە لەوکاتەوەی مسـوڵمان بوومە – بچمە لای لەهەر کاتێک لە کاتەکان دا – وە پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ منی نەدیوە ئیللا زەردەخەنەی کردووە بەڕووم دا }

### واتای وشەکان

**مَا حَجَبَنِي** : ڕێگری لێم نەکردووە، مەنعی نەکردوومە

**النَّبِيُّ** : پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

**مُنْذُ** : لەوکاتەوەی

**أَسْلَمْتُ** : مسوڵمان بوومە

**وَلَا رَآنِي** : وە منی نەدیوە

**إِلَّا تَبَسَّمَ** : ئیللا زەردەخەنەی کردووە

**فِي وَجْهِي** : لە ڕووم دا

## چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١– لەم فەرموودەیەدا فەزڵ و گەورەیی جەریری کوڕی عبد اللَّه ی تێدایە

٢– ئەوپەڕی لوتف و سـۆز و ڕێز و خۆشـەویسـتی تێدایە لە پێغەمبەرەوە بۆ جەریری کوڕی عبد اللَّه

٣– زەردە خەنە کردن بەڕووی خەڵکییەوە لەکاتی گەیشتن دا لە ڕەوشتی پاکی پێغەمبەرە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

٤– هاوەڵان کە چونەتە خزمەت رسول الله ئیزنیان وەرگرتووە و بێ ئیزن و مۆڵەت نەچوونە

## کورتەیەک لە ژیانی جەریری کوڕی عبد اللَّه

ناوی جەریری کوڕی عبد اللَّه ی کوڕی جابری کوڕی مالیکی کوڕی نەضری کوڕی ثەعلەبەیە، کونییەکەی بریتییە لە أبُو عَمْرو، جەریری کوڕی عبد اللَّه گەنجێکی زۆر جوان بوو، پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب دەیفەرموو دەربارەی هُوَ يُوسُفُ هَذِهِ الأُمَّة، واتا: جەریری کوڕی عبد اللَّه یوسفی ئەم ئوممەتەیە، ئەنەسی کوڕی مالیک دەفەرمووێ دەربارەی { خَرَجْتُ مَعَ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْبَجَلِيِّ فِي سَفَرٍ، فَكَانَ يَخْدُمُنِي} واتا: لەگەڵ جەریری کوڕی عبد الله دەرچووم بۆ سەفەرێک، جا جەریر خزمەتی دەکردم، لەگەڵ وەش دا لە ئەنەسی گەورەتربووە، لەدوای مردنی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەچێتە کوفە پاشان دەچێتە قەرقیس هەر لەوێش وەفات دەکات لە ساڵی ٥١ ی کۆچی، ١٠٠ فەرموودەی گێڕاوەتەوە لە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ١٥ فەرموودەیان لە صەحیحەین دا هاتووە

## ٣٨. گەورەیی عَبْدُ اللَّهى کوڕی جەعفەر

عَـنِ ابْـنِ أَبِـي مُلَيْكَـةَ قَـالَ، قَـالَ ابْـنُ الزُّبَيْـرِ لِابْـنِ جَعْفَـرٍ رَضِـيَ اللَّهُ عَـنْهُمْ { أَتَـذْكُرُ إِذْ تَلَقَّيْنَـا رَسُـولَ اللَّهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ أَنَـا وَ أَنْـتَ وَ ابْـنُ عَبَّـاسٍ ؟ قَـالَ : نَعَـمْ، فَحَمَلَنَـا وَتَرَكَـكَ } مُتَّفَـقٌ عَلَيْهِ

**واتای فەرموودەکە**: لە ئیبن ئەبی مولەیکەوە فەرموویەتی: عَبْدُ اللَّه کوڕی زوبەیر بە عَبْدُ اللَّه کوڕی جەعفەری فەرموو اللَّه تَعالَى لێیان ڕازی بێت { ئایا بیرتە لەو کاتەی گەیشـــتینە لای پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـــلَّمَ من و تۆ و عَبْـدُ اللَّه کوڕی عەبباس بووین ؟ عَبْـدُ اللَّه کوڕی جەعفەر فەرمووی بەڵێ، جا ئێمەی هەڵگرت و وازی لە تۆ هێنا }

### واتای وشەکان

**قَالَ ابْنُ الزُّبَيْرِ** : فەرمووی کوڕی زوبەیر ( عَبْدُ اللَّه کوڕی زوبەیر )

**لِابْنِ جَعْفَرٍ** : بە کوڕی جەعفەری ( عَبْدُ اللَّه کوڕی جەعفەر )

**أَتَذْكُرُ** : ئایا بیرتە، یادتە

**إِذْ** : لەوکاتەی

**تَلَقَّيْنَا** : گەیشتین، بەرەو پیلی چووین، پێشوازیمان لێ کرد ( لەو کاتەی لە سەفەر هاتەوە)

**رَسُولَ اللَّهِ** : نێردراوی اللَّه

**أَنَا** : من ( عَبْدُ اللَّه کوڕی زوبەیر )

**وَ أَنْتَ** : وە تۆ ( عَبْدُ اللَّه کوڕی جەعفەر )

**وَ ابْنُ عَبَّاسٍ** : وە عَبْدُ اللَّه کوڕی عەبباس

**قَالَ** : فەرمووی ( عَبْدُ اللَّه کوڕی جەعفەر )

**نَعَمْ** : بەڵێ

**فَحَمَلَنَا** : جا ئێمەی هەڵگرت - پێغەمبەر ئێمەی هەڵگرت بۆ سەر پشتی ولاخەکەی ( واتا عَبْدُ اللَّه کوڕی جەعفەر و عَبْدُ اللَّه کوڕی عەبباسی هەڵگرت )

**وَتَرَكَكَ** : وە وازی لەتۆ هێنا، تۆی تەرک کرد، لە تۆ گەڕا

📖 هەرسێک ئیبنەکە ( ابْنُ الزُّبَيْرِ و ابْنُ جَعْفَرٍ و ابْنُ عَبَّاسٍ ) ناویان عبداللَّه یە

## ۞ چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١– ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەســەر گەورەیی و فەزڵی عَبْـدُ اللَّه کوڕی جەعفەر

٢– لەم فەرموودەیەدا ئەوپەڕی ســۆز و شــەفەقەت و ڕەحمی پێغەمبەری تێدایە، بۆ ئوممەتەکەی، بەتایبەت بە منداڵان

٣– دروســتییەتی فەخر و شــانازی کردن بەوەی پێغەمبەر صَــلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هەڵی گرتووە و لەسەر وڵاخەکەی خۆی داناوە

٤– درووســتە سێ کەس ســواری یەک وڵاخ بن، لێرەدا پێغەمبەر و عَبْدُ اللَّه کوڕی جەعفەر و عَبْدُ اللَّه کوڕی عەبباس سواری یەک وڵاخ بوونە

٥– لەم فەرموودەیەدا ئەوە جێگیر دەبێت کە هەم عَبْدُ اللَّه کوڕی جەعفەر هاوەڵ و صەحابەی پێغەمبەرە هەمیش عَبْدُ اللَّه کوڕی زوبەیر

## کورتەیەکــ لە ژیانـــ پێشەوا عبداللَّه یـــ کوڕیـــ جەعفەر

نـاوی تەواوی بریتییە لە عبـداللّه ی کوڕی جەعفەری کوڕی ئەبووتـالیـب ی کوڕی عبـد المطلـب ی کوڕی هـاشــمە، کونییەکەی بریتییە لە أَبُو جَعْفَر، لەقەب و نـازنـاوی بریـتییە لە بَحْرُ الجُود لەبەر زۆربەخشــینەکەی ئەم نازناوەیان لێ ناوە، وتراوە سەخی ترین کەس بووە، لەو کاتەی جەعفەری باوکی و ئەســمای دایکی کۆچ دەکەن بۆ حەبەشــە عبد الله لەوێ لە دایک دەبێت، یەکەم کەس لە دایک بووە لە کۆچکەرانی حەبەشــە، لەســاڵی ٨٠ی کۆچی وەفاتی کردووە

## ٣٩. پێشەوا حەسسانی کوڕی ثابیت

قَـالَ رَسُـولُ اللَّهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ يَـوْمَ قُرَيْظَـةَ لِحَسَّـانَ بْـنِ ثَابِتٍ { اهْجُ الْمُشْرِكِينَ ؛ فَإِنَّ جِبْرِيلَ مَعَكَ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

**واتـای فەرموودەکە**: پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ لە ڕۆژی جەنگی بەنی قورەیظە دا بە حەسسانی کوڕی ثابیتی فەرموو { قسەیان پێ بڵێ و دایان شۆرە، بێگومان جبریل لەگەڵتە و یارمەتی دەرتە }

### واتای وشەکان

**يَوْمَ قُرَيْظَةَ** : ڕۆژی قورەیظە، لە جەنگی بەنی قورەیظە

**لِحَسَّانَ بْنِ ثَابِتٍ** : بە حەسسانی کوڕی ثابیت، حەسسان شاعیری پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بوو

**اهْجُ** : قسە بڵێ، قسەی ناشیرین بڵێ، دا شۆرە، عەیبدار بکە

**الْمُشْرِكِينَ** : موشریکەکان، هاوبەش دانەران، مُشْرِكِينَ جەمع و کۆیە بۆ وشەی مُشْرِك

**فَإِنَّ** : جا بێگومان

**جِبْرِيلَ** : جبریل، جبریل گه‌وره‌ترین و به‌ڕێزترین مه‌لائیکه‌یه‌ و وه‌حی بۆ پێغه‌مبه‌ران ده‌هێنایه‌ خواره‌وه‌

**مَعَكَ** : له‌گه‌ڵته‌، له‌گه‌ڵ تۆیه‌

## ۞ چه‌ند سوودێک له‌م فه‌رمووده‌یه‌دا

١ – ئه‌م فه‌رمووده‌یه‌ به‌ڵگه‌یه‌ له‌سه‌ر گه‌وره‌یی پێشه‌وا حه‌سسانی کوڕی ثابیت

٢ – پێغه‌مبه‌ر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شاعیری هه‌بووه‌

٣ – گرنگی و سوودی شیعر له‌کات و شوێنی خۆی دا به‌ تایبه‌ت له‌ جه‌نگ و تێکۆشان دا

# کورتەیەک لە ژیانی پێشەوا حەسسانی کوڕی ثابیت

ناوی بریتییە لە حەسسانی کوڕی ثابیتی کوڕی مونذیری کوڕی حەڕامی کوڕی عەمر، شاعیری پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بووە، کونییەکەی بریتییە لە أبو ولید، ئەبو عوبەیدە وتوویەتی فەزڵی حەسسانی کوڕی ثابیت دراوە بەسەر هەموو شاعیرەکانی تردا لە سێ ڕووەوە، یەکەم: حەسسانی کوڕی ثابیت شاعیری ئەنصار بوو لە سەردەمی نەفامیدا، دووەم: شاعیری پێغەمبەر بوو لە سەردەمی پێغەمبەرایەتی دا، سێیەم: شاعیری هەموو یەمەن بووە لە ئیسلام دا، حەسسانی کوڕی ثابیت شاعیرترین کەس بووە لە سەردەمی خۆیدا، هەندێک وەصفیان کردووە بەوەی کەسێکی ترسنۆک بووە بەڵام ئەمە قسەیەکی پوچ و بێ بنەمایە بەڵکوو پێچەوانەکەی ڕاستتر و تەواوترە، پێشەوا حەسسانی کوڕی ثابیت لە پێش ساڵی ٤٠ی کۆچی دا وەفاتی کردووە لە سەردەمی خەلافەتی پێشەوا عەلی کوڕی ئەبووتالیب، زانایان دەفەرموون حەسسانی کوڕی ثابیت تەمەنی لە ١٠٠ ساڵ زیاتر بوو کاتێک وەفاتی کرد

ئەمەش چەند بەیتە شیعرێکی حەسسانی کوڕی ثابیتە، بەرگری لە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەکات و مەدح و ستایشی دەکات و قسەی ناشیرینیش بە موشریکەکانی قورەیشی دەڵێت لەخزمەت پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دا

هَجَوْتَ مُحَمَّدًا فَأَجَبْتُ عَنْهُ

وَعِنْدَ اللَّهِ فِي ذَاكَ الْجَزَاءُ

هَجَوْتَ مُحَمَّدًا بَرًّا حَنِيفًا

رَسُولَ اللَّهِ شِيمَتُهُ الْوَفَاءُ

فَإِنَّ أَبِي وَوَالِدَهُ وَعِرْضِي

لِعِرْضِ مُحَمَّدٍ مِنْكُمْ وِقَاءُ

ثَكِلْتُ بُنَيَّتِي إِنْ لَمْ تَرَوْهَا

تُثِيرُ النَّقْعَ مِنْ كَنَفَيْ كَدَاءِ

يُبَارِينَ الْأَعِنَّةَ مُصْعِدَاتٍ

عَلَى أَكْتَافِهَا الْأَسَلُ الظِّمَاءُ

تَظَلُّ جِيَادُنَا مُتَمَطِّرَاتٍ

تُلَطِّمُهُنَّ بِالْخُمُرِ النِّسَاءُ

فَإِنْ أَعْرَضْتُمُو عَنَّا اعْتَمَرْنَا

وَكَانَ الْفَتْحُ وَانْكَشَفَ الْغِطَاءُ

وَإِلَّا فَاصْبِرُوا لِضِرَابِ يَوْمٍ

يُعِزُّ اللَّهُ فِيهِ مَنْ يَشَاءُ

وَقَالَ اللَّهُ قَدْ أَرْسَلْتُ عَبْدًا

يَقُولُ الْحَقَّ لَيْسَ بِهِ خَفَاءُ

وَقَالَ اللَّهُ قَدْ يَسَّرْتُ جُنْدًا

هُمُ الْأَنْصَارُ عُرْضَتُهَا اللِّقَاءُ

يُلَاقِي كُلَّ يَوْمٍ مِنْ مَعَدٍّ

سِبَابٌ أَوْ قِتَالٌ أَوْ هِجَاءُ

فَمَنْ يَهْجُو رَسُولَ اللَّهِ مِنْكُمْ

وَيَمْدَحُهُ وَيَنْصُرُهُ سَوَاءُ

وَجِبْرِيلٌ رَسُولُ اللَّهِ فِينَا

وَرُوحُ الْقُدْسِ لَيْسَ لَهُ كِفَاءُ

له صحيح مسلم دا هاتووه

## ٤٠. سالمی مەولای أبو حوذەیفه

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

{ خُـذُوا الْقُـرْآنَ مِـنْ أَرْبَعَـةٍ : مِـنِ ابْـنِ أُمِّ عَبْـدٍ - فَبَـدَأَ بِـهِ - وَمُعَـاذِ بْـنِ جَبَـلٍ، وَأُبَيِّ بْـنِ كَعْـبٍ، وَسَـالِمٍ مَـوْلَى أَبِي حُذَيْفَـةَ }

مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

**واتای فەرموودەکە**: پێغەمبەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ فەرموویەتی {قورئان وەرگرن لە چوار کەس، لە کوڕی ئوم عەبد - بەو دەسـتی پێ کرد - و موعاذی کوڕی جەبەل و ئوبەی کوڕی کەعب و سـالمی مەولای ئەبو حوذەیفە }

**واتای وشەکان**

**خُذُوا الْقُرْآنَ** : قورئانی پیرۆز وەرگرن، خۆتان فێرە قورئان بکەن

**مِنْ أَرْبَعَةٍ** : لە چوار کەس، لە چوار هاوەڵ

**مِنِ ابْنِ أُمِّ عَبْدٍ** : لە کوڕی دایکی عەبـد، واتـا عبـداللَّه ی کوڕی مەسعوود

**فَبَدَأَ بِهِ** : جا بەو دەسـتی پێ کرد، بە کوڕی ئوم عەبد دەسـتی پێ کرد، بە عبداللَّه ی کوڕی مەسعوود دەستی پێ کرد

**وَمُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ** : وە موعاذی کوڕی جەبەل

**وَ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ** : وە ئوبەی کوڕی کەعب

**وَسَالِمٍ مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ** : وە سالمی مەولای ئەبو حوذەیفە

## ۞ چەند سوودێک لەم فەرموودەیەدا

١ – ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر گەورەیی پێشەوا سالمی مەولای ئەبو حوذەیفە

٢ – فەزڵ و گەورەیی قورئانی پیرۆز و هەوڵدان بۆ شارەزابوون و لەبەر کردن و تێگەیشتن و کردەوە پێکردنی

٣ – قورئان وەرگرتن و خۆ فێرکردن لەلای ئەو کەسانەی شارەزاییان هەیە بە قورئان

## کورتەیەک لە ژیانی پێشەوا سالمی مەولای ئەبو حوذەیفە

ناوی سالمی کوڕی مەعقیلە، کۆیلەی ئەبو حوذەیفەی کوڕی عوتبەی کوڕی ڕەبیعەبووە، کونییەکەی بریتییە لە أبو عبد اللَّه، خەڵکی فارس بووە، بەیەکێک لە هاوەڵە بەڕێزەکان هەژمار دەکرێ، ئامادەی شەڕی بەدریش بووە، لە ساڵی ١٢ ی کۆچی شەهید دەکرێت لە شەڕی یەمامەدا

## تەواوی ٤٠ فەرموودەکان

❁ عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ

{ نَظَرْتُ إِلَى أَقْدَامِ الْمُشْرِكِينَ عَلَى رُءُوسِنَا وَنَحْنُ فِي الْغَارِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَوْ أَنَّ أَحَدَهُمْ نَظَرَ إِلَى قَدَمَيْهِ؛ أَبْصَرَنَا تَحْتَ قَدَمَيْهِ. فَقَالَ: يَا أَبَا بَكْرٍ، مَا ظَنُّكَ بِاثْنَيْنِ اللَّهُ ثَالِثُهُمَا؟ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

❁ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

{ دَخَلْتُ الْجَنَّةَ، فَرَأَيْتُ فِيهَا دَارًا - أَوْ قَصْرًا - فَقُلْتُ : لِمَنْ هَذَا ؟ فَقَالُوا : لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، فَأَرَدْتُ أَنْ أَدْخُلَ، فَذَكَرْتُ غَيْرَتَكَ " فَبَكَى عُمَرُ، وَقَالَ : أَيْ رَسُولَ اللَّهِ، أَوَعَلَيْكَ يُغَارُ؟ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

❁ عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ { كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُضْطَجِعًا فِي بَيْتِي كَاشِفًا عَنْ فَخِذَيْهِ - أَوْ سَاقَيْهِ - فَاسْتَأْذَنَ أَبُو بَكْرٍ فَأَذِنَ لَهُ وَهُوَ عَلَى تِلْكَ الْحَالِ، فَتَحَدَّثَ، ثُمَّ اسْتَأْذَنَ عُمَرُ فَأَذِنَ لَهُ وَهُوَ كَذَلِكَ، فَتَحَدَّثَ، ثُمَّ اسْتَأْذَنَ عُثْمَانُ، فَجَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَسَوَّى ثِيَابَهُ فَدَخَلَ فَتَحَدَّثَ، فَلَمَّا خَرَجَ قَالَتْ عَائِشَةُ : دَخَلَ أَبُو بَكْرٍ فَلَمْ تَهْتَشَّ لَهُ، وَلَمْ تُبَالِهِ، ثُمَّ دَخَلَ عُمَرُ فَلَمْ

تَهْتَشَّ لَهُ، وَلَمْ تُبَالِهِ، ثُمَّ دَخَلَ عُثْمَانُ فَجَلَسْتَ، وَسَوَّيْتَ ثِيَابَكَ ؟ فَقَالَ : أَلَا أَسْتَحِي مِنْ رَجُلٍ تَسْتَحِي مِنْهُ الْمَلَائِكَةُ } رواه مسلم

❁ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِعَلِيٍّ

{ أَنْتَ مِنِّي بِمَنْزِلَةِ هَارُونَ مِنْ مُوسَى، إِلَّا أَنَّهُ لَا نَبِيَّ بَعْدِي }

مُتَّفَقٌ عَليه

❁ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

{ خَيْرُ نِسَائِهَا مَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ، وَخَيْرُ نِسَائِهَا خَدِيجَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ}

مُتَّفَقٌ عَليه

❁ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

{ كَمَلَ مِنَ الرِّجَالِ كَثِيرٌ، وَلَمْ يَكْمُلْ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا آسِيَةُ امْرَأَةُ فِرْعَوْنَ وَمَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ، وَإِنَّ فَضْلَ عَائِشَةَ عَلَى النِّسَاءِ كَفَضْلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَائِرِ الطَّعَامِ } مُتَّفَقٌ عَليه

❁ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

{ فَاطِمَةُ بَضْعَةٌ مِنِّي، فَمَنْ أَغْضَبَهَا أَغْضَبَنِي } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

❁ عَـنْ زَيْنَـبَ بِنْـتِ جَحْـشٍ رَضِـيَ اللَّهُ عَنْهَـا قَالَـتْ { **زَوَّجَكُـنَّ أَهْلُـوكُنَّ وَزَوَّجَنِـي اللَّهُ مِـنْ فَـوْقِ سَـبْعِ سَـمَاوَاتٍ** } رواه الترمـذي والبخـاري وغيرهما واللفظ للترمذي

❁ عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رَضِـيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: **رَأَيْتُ الْحَسَـنَ بْنَ عَلِيٍّ عَلَى عَاتِقِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَهُوَ يَقُولُ { اللَّهُمَّ إِنِّي أُحِبُّهُ فَأَحِبَّهُ}** مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

❁ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

{ **إِنَّ الْحَسَـنَ وَالْحُسَـيْنَ هُمَـا رَيْحَانَتَـايَ مِـنَ الـدُّنْيَا** } رواه البخـاري و أحمد و الترمذي واللفظ له

❁ عَـنِ الْبَـرَاءِ بْـنِ عَـازِبٍ ، **أَنَّ النَّبِـيَّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قَـالَ لِجَعْفَـرِ بْـنِ أَبِـي طَالِـبٍ{ أَشْـبَهْتَ خَلْقِـي وَخُلُقِـي }** رواه البخـاري و الترمذي وغيرهما

❁ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

{ **لِكُلِّ أُمَّةٍ أَمِينٌ، وَأَمِينُ هَذِهِ الْأُمَّةِ أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ** } مُتَّفَقٌ عَليه

❁ عَـنْ عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْـهُ قَـالَ { مَـا سَـمِعْتُ النَّبِـيَّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ جَمَـعَ أَبَوَيْـهِ لِأَحَـدٍ إِلَّا لِسَـعْدِ بْـنِ مَالِـكٍ ؛ فَـإِنِّي سَـمِعْتُهُ يَقُولُ يَوْمَ أُحُدٍ : يَا سَعْدُ، ارْمِ فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

❁ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

{ إِنَّ لِكُـلِّ نَبِـيٍّ حَوَارِيًّـا ، وَإِنَّ حَـوَارِيَّ الزُّبَيْـرُ بْـنُ الْعَـوَّامِ } مُتَّفَـقٌ عَلَيْهِ

❁ عَـنْ أَبِي عُثْمَـانَ ، قَـالَ { لَـمْ يَبْـقَ مَـعَ النَّبِـيِّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ فِي بَعْـضِ تِلْـكَ الْأَيَّـامِ الَّتِـي قَاتَـلَ فِـيهِنَّ رَسُـولُ اللَّهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ غَيْرُ طَلْحَةَ ، وَسَعْدٍ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

❁ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

{ أَبُـو بَكْـرٍ فِي الْجَنَّـةِ، وَعُمَـرُ فِي الْجَنَّـةِ، وَعُثْمَـانُ فِي الْجَنَّـةِ، وَعَلِيٌّ فِي الْجَنَّـةِ، وَطَلْحَـةُ فِي الْجَنَّـةِ، وَالزُّبَيْرُ فِي الْجَنَّـةِ، وَعَبْـدُ الـرَّحْمَنِ بْـنُ عَـوْفٍ فِي الْجَنَّـةِ، وَسَـعْدٌ فِي الْجَنَّـةِ، وَسَـعِيدٌ فِي الْجَنَّـةِ، وَ أَبُـو عُبَيْـدَةَ بْـنُ الْجَـرَّاحِ فِي الْجَنَّـةِ } رواه الترمـذي واللفـظ لـه وأحمـد و أبـو داود و ابن ماجه

❁ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

{ **يَـدْخُلُ مِـنْ أُمَّتـِي الْجَنَّـةَ سَـبْعُونَ أَلْفًـا بِغَيـْرِ حِسَـابٍ " فَقَـالَ رَجُـلٌ : يَـا رَسُـولَ اللَّهِ، ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِـي مِـنْهُمْ. قَـالَ : اللَّهُـمَّ اجْعَلْـهُ مِـنْهُمْ " ثُـمَّ قَـامَ آخَـرُ، فَقَـالَ : يَـا رَسُـولَ اللَّهِ، ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، قَالَ : سَبَقَكَ بِهَا عُكَّاشَةُ** } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

❁ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

{ **إِهْتَزَّ الْعَرْشُ لِمَوْتِ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ** } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

❁ عَـنْ جَرِيـرٍ رَضِـيَ اللَّهُ عَنْـهُ، قَـالَ { **مَـا حَجَبَنِـي النَّبِـيُّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ مُنْـذُ أَسْـلَمْتُ، وَلَا رَآنِـي إِلَّا تَبَسَّـمَ فِي وَجْهِـي** } مُتَّفَـقٌ عَلَيْهِ

❁ عَـنْ سَـعْدِ ابْـنِ أَبِـي وَقَّـاصٍ قَـالَ { **مَـا سَـمِعْتُ النَّبِـيَّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ يَقُـولُ لِأَحَـدٍ يَمْشِي عَلَى الْأَرْضِ إِنَّـهُ مِـنْ أَهْـلِ الْجَنَّـةِ إِلَّا لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلَامٍ** } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

❁ عَـنْ أَنَـسِ بْـنِ مَالِـكٍ رَضِـيَ اللَّهُ عَنْـهُ، قَـالَ رَسُـولُ اللَّهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ لِأُبَـيٍّ { **إِنَّ اللَّهَ أَمَرَنِـي أَنْ أَقْـرَأَ عَلَيْـكَ ( لَـمْ يَكُـنِ الَّـذِينَ كَفَـرُوا مِـنْ أَهْـلِ الْكِتَـابِ ) قَـالَ : وَسَـمَّانِي ؟ قَـالَ : نَعَـمْ " فَبَكَـى** } مُتَّفَـقٌ عَلَيْهِ

❁ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ

{ **قُلْـتُ : يَـا رَسُـولَ اللَّهِ، ادْعُ اللَّهَ أَنْ يُحَبِّبَنِـي أَنَـا وَأُمِّـي إِلَـى عِبَـادِهِ الْمُـؤْمِنِينَ، وَيُحَبِّـبَهُمْ إِلَيْنَـا. قَـالَ، فَقَـالَ رَسُـولُ اللَّهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ اللَّهُـمّ حَبِّـبْ عُبَيْـدَكَ هَـذَا – يَعْنِـي أَبَـا هُرَيْـرَةَ - وَأُمَّـهُ إِلَـى عِبَادِكَ الْمُؤْمِنِينَ، وَحَبِّبْ إِلَيْهِمُ الْمُؤْمِنِينَ** } رواه مسلم

❁ عَـنِ ابْـنِ عُمَـرَ ، عَـنْ أُخْتِـهِ حَفْصَـةَ ، أَنَّ النَّبِـيَّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قَالَ لَهَا { **إِنَّ عَبْدَ اللَّهِ رَجُلٌ صَالِحٌ** } مُتَّفَقٌ عليه

❁ عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ { **أَنَّ النَّبِـيَّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ دَخَـلَ الْخَـلَاءَ فَوَضَـعْتُ لَـهُ وَضُـوءًا، قَـالَ : مَـنْ وَضَـعَ هَـذَا ؟ فَـأُخْبِرَ، فَقَـالَ : اللَّهُمَّ فَقِّهْهُ فِي الدِّينِ** } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

❁ عَـنِ ابْـنِ أَبِـي مُلَيْكَـةَ قَـالَ، قَـالَ ابْـنُ الزُّبَيْـرِ لِابْـنِ جَعْفَـرٍ رَضِـيَ اللَّهُ عَـنْهُمْ { **أَتَـذْكُرُ إِذْ تَلَقَّيْنَـا رَسُـولَ اللَّهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ أَنَـا وَأَنْتَ وَابْنُ عَبَّاسٍ ؟ قَالَ : نَعَمْ، فَحَمَلَنَا وَتَرَكَكَ** } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

❁ عَـنْ مُعَـاذِ بْـنِ جَبَـلٍ ، أَنَّ رَسُـولَ اللَّهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ أَخَـذَ بِيَـدِهِ وَقَـالَ { **يَـا مُعَـاذُ، وَاللَّهِ إِنِّـي لَأُحِبُّـكَ، وَاللَّهِ إِنِّـي لَأُحِبُّـكَ " فَقَـالَ : أُوصِـيكَ يَـا مُعَـاذُ، لَا تَـدَعَنَّ فِي دُبُـرِ كُلِّ صَلَاةٍ تَقُـولُ : اللَّهُـمَّ أَعِنِّي عَلَـى ذِكْـرِكَ وَشُـكْرِكَ وَحُسْـنِ عِبَادَتِـكَ** } رواه أبـو داود و أحمـد و النسائي وهو حديث حسن

❁ عَـنْ أَنَـسٍ رَضِـيَ اللَّهُ عَنْـهُ قَـالَ { **قَالَـتْ أُمِّـي : يَـا رَسُـولَ اللَّهِ، خَادِمُـكَ أَنَـسٌ ادْعُ اللَّهَ لَـهُ. قَـالَ : اللَّهُـمَّ أَكْثِرْ مَالَـهُ وَوَلَـدَهُ، وَبَـارِكْ لَهُ فِيمَا أَعْطَيْتَهُ** } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

❁ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

{ **دَخَلْـتُ الْجَنَّـةَ فَسَـمِعْتُ خَشْـفَةً ، فَقُلْـتُ : مَـنْ هَـذَا ؟ قَـالُوا : هَـذِهِ الْغُمَيْصَـاءُ بِنْـتُ مِلْحَـانَ، أُمُّ أَنَـسِ بْـنِ مَالِـكٍ** } مُتَّفَـقٌ عَلَيْـهِ واللفظ لمسلم

❁ عَـنْ أَنَـسٍ رَضِـيَ اللَّهُ عَنْـهُ { **جَمَـعَ الْقُـرْآنَ عَلَى عَهْـدِ النَّبِـيِّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ أَرْبَعَـةٌ كُلُّهُـمْ مِـنَ الْأَنْصَـارِ؛ أُبَـيٌّ، وَمُعَـاذُ بْـنُ جَبَـلٍ، وَ أَبُو زَيْدٍ، وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ** } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

❁ عَـنْ أَنَـسٍ ، أَنَّ رَسُـولَ اللَّهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ أَخَـذَ سَـيْفًا يَـوْمَ أُحُـدٍ، فَقَـالَ { **مَـنْ يَأْخُـذُ مِنِّـي هَـذَا ؟ فَبَسَـطُوا أَيْـدِيَهُمْ، كُـلُّ إِنْسَـانٍ مِنْهُمْ يَقُـولُ : أَنَـا أَنَـا. قَـالَ : فَمَـنْ يَأْخُـذُهُ بِحَقِّـهِ ؟ قَـالَ: فَـأَحْجَمَ الْقَـوْمُ ، فَقَـالَ سِـمَاكُ بْـنُ خَرَشَـةَ أَبُـو دُجَانَـةَ: أَنَـا آخُـذُهُ بِحَقِّـهِ. قَالَ : فَأَخَذَهُ، فَفَلَقَ بِهِ هَامَ الْمُشْرِكِينَ** } رواه مسلم و أحمد

❁ قَـالَ رَسُـولُ اللَّهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ { **يَـا أَبَـا مُوسَـى، لَقَـدْ أُعْطِيـتَ مِزْمَـارًا مِـنْ مَزَامِيـرِ آلِ دَاوُدَ** } رواه البخـاري و مسـلم والنسائي و الدارمي و أحمد والترمذي واللفظ له

❁ عَـنْ عَبْـدِ اللَّهِ بْـنِ عُمَـرَ رَضِـيَ اللَّهُ عَنْهُمَـا قَـالَ { **مَـا كُنَّـا نَـدْعُو زَيْـدَ بْـنَ حَارِثَـةَ إِلَّا زَيْـدَ ابْـنَ مُحَمَّـدٍ حَتَّـى نَزَلَـتْ : { ادْعُـوهُمْ لِآبَـائِهِمْ هُـوَ أَقْسَطُ عِنْدَ اللَّهِ }** } رواه البخاري و مسلم والترمذي واللفظ له

❀ عَـنْ أُسَـامَةَ بْـنِ زَيْـدٍ رَضِـيَ اللَّهُ عَنْهُمَـا، حَـدَّثَ عَـنِ النَّبـيِّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ { **أَنَّـهُ كَـانَ يَأْخُـذُهُ وَالْحَسَـنَ فَيَقُـولُ : اللَّهُـمَّ أَحِبَّهُمَـا ؛ فَإِنِّي أُحِبُّهُمَا** } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

❀ عَـنْ أَنَـسٍ قَـالَ : قَـالَ أَبُـو بَكْـرٍ رَضِـيَ اللَّهُ عَنْـهُ بَعْـدَ وَفَـاةِ رَسُـولِ اللَّهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ لِعُمَـرَ { **انْطَلِـقْ بِنَـا إِلَى أُمِّ أَيْمَـنَ نَزُورُهَـا، كَمَـا كَـانَ رَسُـولُ اللَّهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ يَزُورُهَـا. فَلَمَّـا انْتَهَيْنَـا إِلَيْهَـا بَكَـتْ، فَقَـالَا لَهَـا : مَـا يُبْكِيـكِ ؟ مَـا عِنْـدَ اللَّهِ خَيْـرٌ لِرَسُـولِهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ. فَقَالَـتْ : مَـا أَبْكِي أَنْ لَا أَكُـونَ أَعْلَـمُ أَنَّ مَـا عِنْـدَ اللَّهِ خَيْـرٌ لِرَسُـولِهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ، وَلَكِـنْ أَبْكِي أَنَّ الْـوَحْيَ قَـدِ انْقَطَـعَ مِـنَ السَّـمَاءِ. فَهَيَّجَتْهُمَـا عَلَـى الْبُكَـاءِ، فَجَعَـلَا يَبْكِيَـانِ مَعَهَا** } رواه مسلم

❀ عَنْ خَبَّابِ بْنِ الْأَرَتِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ

{ **مُصْـعَبُ بْـنُ عُمَيْـرٍ قُتِـلَ يَـوْمَ أُحُـدٍ، وَلَـمْ تَكُـنْ لَـهُ إِلَّا نَمِـرَةٌ ، كُنَّـا إِذَا غَطَّيْنَـا بِهَـا رَأْسَـهُ خَرَجَـتْ رِجْـلَاهُ، وَإِذَا غَطَّيْنَـا رِجْلَيْـهِ خَـرَجَ رَأْسُـهُ، فَقَـالَ رَسُـولُ اللَّهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ : غَطُّـوا بِهَـا رَأْسَـهُ،**

**وَاجْعَلُـوا عَلَـى رِجْلَيْـهِ مِـنَ الْإِذْخِـرِ** } رواه البخـاري و مسـلم والنسـائي والترمذي و أحمد وأبو داود واللفظ له

❁ عَـنْ أَنَـسٍ رَضِـيَ اللَّهُ عَنْـهُ، أَنَّ النَّبِـيَّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ نَعَـى زَيْـدًا، وَجَعْفَـرًا، وَابْـنَ رَوَاحَـةَ لِلنَّـاسِ قَبْـلَ أَنْ يَـأْتِيَهُمْ خَبَـرُهُمْ، فَقَـالَ { **أَخَـذَ الرَّايَـةَ زَيْـدٌ فَأُصِـيبَ، ثُـمَّ أَخَـذَ جَعْفَـرٌ فَأُصِـيبَ، ثُـمَّ أَخَـذَ ابْـنُ رَوَاحَـةَ فَأُصِـيبَ - وَعَيْنَـاهُ تَـذْرِفَانِ – حَتَّـى أَخَـذَ سَـيْفٌ مِـنْ سُـيُوفِ اللَّهِ حَتَّـى فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ** } رواه البخاري و أحمد

❁ قَـالَ رَسُـولُ اللَّهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ لِـبِلَالٍ عِنْـدَ صَـلَاةِ الْغَـدَاةِ { **يَـا بِـلَالُ، حَـدِّثْنِي بِـأَرْجَى عَمَـلٍ عَمِلْتَـهُ عِنْـدَكَ فِـي الْإِسْـلَامِ مَنْفَعَـةً، فَـإِنِّي سَـمِعْتُ اللَّيْلَـةَ خَشْـفَ نَعْلَيْـكَ بَـيْنَ يَـدَيَّ فِـي الْجَنَّـةِ " قَـالَ بِـلَالٌ : مَـا عَمِلْـتُ عَمَـلًا فِي الْإِسْـلَامِ أَرْجَى عِنْـدِي مَنْفَعَـةً، مِـنْ أَنِّـي لَا أَتَطَهَّـرُ طُهُـورًا تَامًّـا فِـي سَـاعَةٍ مِـنْ لَيْـلٍ وَلَا نَهَـارٍ؛ إِلَّا صَـلَّيْتُ بِذَلِكَ الطُّهُورِ مَا كَتَبَ اللَّهُ لِي أَنْ أُصَلِّيَ** } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

❁ عَنْ أَبِي مُوسَى رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ { **قَدِمْتُ أَنَا وَأَخِي مِنَ الْيَمَنِ، فَمَكَثْنَا حِينًا مَا نُرَى ابْنَ مَسْعُودٍ وَأُمَّهُ إِلَّا مِنْ أَهْلِ الْبَيْتِ، مِنْ كَثْرَةِ دُخُولِهِمْ، وَلُزُومِهِمْ لَهُ** } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

❁ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ قُرَيْظَةَ لِحَسَّانَ بْنِ ثَابِتٍ { **اهْجُ الْمُشْرِكِينَ ؛ فَإِنَّ جِبْرِيلَ مَعَكَ** } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

❁ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

{ **خُذُوا الْقُرْآنَ مِنْ أَرْبَعَةٍ : مِنِ ابْنِ أُمِّ عَبْدٍ - فَبَدَأَ بِهِ - وَمُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، وَ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، وَسَالِمٍ مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ** } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

# فهرس